

پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# مارکس

## لە تەرازووی ژیرییدا

نوسینی:
مامۆستا موحەممەد مەلا ساڵحی شارەزووری



زنجیرە پەیامەکانی گۆڤاری ڕێنوێن ژمارە ( ٢٨ )

📖 ناوی کتێب : مارکس لە تەرازووی ژێریدا

✍ نوسینی : موحەممەد صالح ئەبوبکر شارەزووری

✏ ناوی زنجیرە: زنجیرەی بابەتە فیکرییەکان

* ژمارەی زنجیرە: ٥

* تیراژ : ٢٠٠٠ دانە

* نۆبەی چاپ: یەکەم

* ساڵی چاپ: ٢٠١٥

* ژمارەی لاپەڕە : ١٦٠ لاپەڕە

* دیزاین : گۆڤاری ڕێنوێن

* پێداچونەوەی: کۆچەر محمد مەلا صالح

* چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ

* نرخ : تەنها (٣٥٠٠ ) دینار

* سەرپەرشتیکار : سەرکۆ کریم احمد

* ئیمەیڵ: renwen2009@yahoo.com

* ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی ( ١٤٢٣)ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە

( ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەکات )

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾

﴿ سورة المائدة ( ٥٠ ) ﴾

## شارستانیەتی ئەوروپا :

کاتێ ئەدیسۆن کارەبای دۆزییەوەو سەرزەوی ڕووناك کردەوە ئەم چەرخەی کە ئێستا ئێمە و مرۆڤانی تری سەرزەوی تێدا ئەژی، ناونرا بە چەرخی ڕووناکی (عصر النور)، پاش ماوەیەکی تر کە ئەتۆم دۆزرایەوە و چەکەکانی ئەتۆم بونە ماسولکە و فویان تێکرا . بێ مەلا و بێ گوێزە بانە . بانگ درا بە گوێی چەرخەکەمانداو ناونرا بە چەرخی ئەتۆم (عصر الذرة)، پاش ماوەیەکی تر کە گەشتەکانی ئاسمانی دەستی پێ کرد و بەرەو مانگ کشان بۆ ئەوەی بیکەنە بنکەیەکی ئەتۆمی دژی دانیشتوانی سەرزەوی، دیسان ناوی چەرخەکەیان گۆڕی و ناویان نا چەرخی بۆشاییەکانی ئاسمان (عصر الفضاء)، بەلام وابزانم شیاوترین ناو بۆ ئەم چەرخە ئەوەیە ناوبنرێت چەرخی لاسایی کردنەوە (عصر الموضات) لاسایی کردنەوە لە هەموو شتێکدا، لاسایی کردنەوە لە بەرگدا، لاسایی کردنەوەی لە شێوەدا، لاسایی کردنەوەی لە بیروباوەڕدا، لاسایی لە یاسادا.. هتد.

لاوەکانی ئێمە وەکو تیپێکی مۆسیقایان لێهاتووە، هەریەکەیان ئامێرێکی مۆسیقی گرتووە بە دەستەوە (مایسترۆیەك) لەبەردەمیاندا وەستاوەو لەسەر ئاوازی دوژمنەکانیان چۆن

نیشـان کردیـان بکـات، بـەو شـێوەیە زوڕناکـەیان لـێ ئـەدەن و دەهۆڵەکەیان ئەکوتن.

یـان یانـەی بـەرگ (دار الأزیـاء)ی پـاریس، چ جـۆرە مۆدێلێـك دەربکـات، کچـانی ئێمـەش پـڕ بـە پێسـتی ئەیـدروون و لەبـەری ئەکـەن و لەشـیان ڕووت ئەکـەن بـۆ مێشـکی چاوچـنۆکەکان و لاساییەکی بێ تام لە لایەن کچ و کوڕەکانمانەوە، ئەمە نەك تەنها لـە ڕووی جل‌وبەرگـەوە، بـەڵکو لـە ڕووی بیروباوەڕ و ڕەوشـت و یاسایشەوە ئەوان چییان فەرموو، هـەر ئەوەیـە، هەرکـەس لاریـی هـەبێ، ئـەوە کۆنەپەرستە و دواکـەوتووە، مرۆڤـی نیاندەرتاڵـە و زیندووبۆتەوەو. هۆی ئەمانە گشت چییە ؟

هـۆی ئەوەیـە تووشـی نەخۆشـی شکسـتی گیـانی ( الهزیمـة الروحیة ) بووبن و بە چاوێکی ئەبڵـەق و هۆشـێکی سـەرسامەوە سەیری شارستانیەتی ئەمڕۆی ئەوروپا ئەکەین و شارستانیەتی ئەوان بەشێوەیەك سـەرنجیان ڕاکێشاوین، کە ئێمە هـەر ملچەی دەممـان دێـت و کـەلێنێکی (ئایـدۆلۆژیمان) تێکـەوتووە، ئـەم وتانەی سەرەوەتان بەلاوە سەیر نەبێت، ئەوەتە....

برایـەکی مووسـوڵمان کـە خـەڵکی هـەولێرە و لـە ئـەڵمانیای ڕۆژئاوا ئەخوێنێ، نامەیەکی بۆ نووسیم و تێیدا ئەڵێ:

کاتـێ هاتمـه ئـهڵمانیا و لـه کۆلێـژی زانیارییـهکانی ئـابووری ڕامیاری وەرگیرام و بڕیارمدا لێره بخوێنم، چەند برایەکی قوتابی موسڵمان و دڵگەرم بۆ ئیسلام، ئەکرێزانەوە بۆم، ئەیانوت: تۆ چۆن لـه نـاو ئـهم هـهموو بـهڕهڵایی و بیروبـاوهڕه ئـاڵۆزهدا هـهڵ ئەکەی؟ چۆن ئـایین ڕێت ئـهدات تۆ لـه وڵاتێکـی ئیسلامی لەناو گـهلێکی موسـڵمانهوه بێیـت بـۆ نـاو گـهلێکی وا خوانـهناس و بـهرهڵڵا؟ ئەمانـەو هـەزاران جۆره پرسـیار و کێشـهی تـر ڕێگا بـه قوتـابی مووسـوڵمان و ڕۆڵـهی مووسـوڵمان ئـهگرێت، بـه ڕای مـن هـۆی ئەوەیـه زۆربـهی زۆری مووسـوڵمانهکان هەڵوێسـتی ئایینەکـەی خۆیـان بەرامبـەر بـەو شارسـتانییەتە نـازانن و نـەك تەنیا تاکەکانی کۆمـەڵ، یـان کۆمـەڵی موسـڵمانان نـایزانن، بـەڵکو کاربەدەسـتان و جڵەوبەدەسـتانی وڵاتـە ئیسـلامییەکانیش نایزانن، یان نایانەوێ بیزانن، چونکه کاربەدەستانی ئـەم وڵاتانـه بـه شـیری ئـەم شارسـتانیەتە و بیروبـاوەڕی ئـەو ئەوروپایـه گۆشکراون..

لەبەرئەوە هەقیانە ئەگەر خۆشیان گێل بکەن و چاوپێچێکیش بدەن بەسەر چاوی گەلەکەیاندا، هەرچەندە لابردنی ئەو تەموژە و چڕە دووکەڵە، بە یەکێکی وەکو من ناکرێ، چونکە ئەرکێکی

گەلێك گرانە، بەڵام لەبەر بێ کەسی و نەبونی نووسەر، وا شانم دایە بەری و دەست لە دەست و قوەت لە خوا.

پێشەکی کە ئێمە باسی شارستانیەتی ئەوروپا ئەکەین و بەراوردی ئەکەین لەگەڵ ئیسلامدا، مانای وایە وڵاتە رۆژهەڵاتییەکانیش هەڵسەنگێنراون، چونکە ئەگەر رووی وشەی رەنگا و رەنگ و کاوێژکراو و ئەدەن بە گوێماندا و بە چاوێکی تیژ و ورد و بیرێکی قووڵەوە سەیری شارستانیەتی وڵاتانی رۆژهەڵات بکەین، لە هەموو روویەکی شارستانییەوە، بۆمان دەردەکەوێت ئەویش هەر زادە و نەخشەی شارستانیەتەکەی ئەوروپایە و هیچ جیاوازییەکی سەرەکییان نییە، بەڵکو ئەتوانین رۆژهەڵاتییەکان دابنێین بە شاگرد و کاسەلێسی ئەوان، لە هەموو رواڵەتێکی شارستانیەکەیانەوە، لە رووی پیشەسازی و تەکنەلۆژی و چ لە رووی بیروباوەڕ و بیرکردنەوەیان و چ لە رێبازی ژیانیان، بەڵکو مامۆستاکانیان (بتەکانیان) جولەکەن و ئەوروپین و ئێمەی موسوڵمان بڕوامان بە سەربازگەی سەرمایەداری و سۆشیالیستی نییە، بەڵکو بڕوامان بە سەربازگەی باوەڕ و بێ باوەڕی (الایمان والکفر) هەیە، چونکە یان خوا هەیە وەکو ئێمەی موسوڵمان دەڵێین، یان خوا نییە وەك ئەوان ئەیڵێن، جا کە هەر وتمان شارستانی ئەوروپا،

مەبەسـتمان لـە هـەردوو بەشـە كفرەكەيـە، چ ڕۆژهـەڵاتی چ ڕۆژئـاوایی، لـە بەشـی دوایـی، ڕێكـەوت لـە تـەرازووی ژێرییـدا، وريابە وەسيەت نامەيەكم بۆ كاوە و بۆ هەموو سەرلێشێواوێكەی تـری وەكـو كـاوە، نووسـيوە و ڕامگەيانـدووە كـە گـرۆی ئادەميزادانی ئەمڕۆ لەسەر كەندەڵانێكی زۆر قووڵ ڕاوەستاون و هـيچ ئاگايـان لـە خۆيـان نييـە، كەندەڵانەكـەش وردە وردە دەڕووخـێ و هاكـا هەرەسـی هێنـا و بـە ناسـۆرترين شـێوە سەرەوخوار بونەو.

ئەمـە نـەك تـەنها بـە هـۆی چـەكە ستراتيژييەكانەوە و كـوێرە ڕۆكێتـی ئاشـتی خوازەكانـەوە، نـەخێر تـەنيا ئـەوە نييە، بەڵكو ئـەوەو لـەوەش گـرنگتر كـە بريتييـە لـە گسـكدانی باخـەڵی شارسـتانيەتی مادديـەت لـە بازاڕی ڕەوشـت و بيروبـاوەڕدا، ئـەم ڕاستييە ئەوەنـدە ئاشـكرايە بـە هـيچ جۆرێـك ڕێگـای ملـە ملێـی كەسـی نەهێشـتۆتەوە، سـتوونی ئـەو ئـاڵای ديموكراتييـەی كـە ئـەورووپا هـەڵی گرتبـوو، وردە وردە سـەرەوخوار بـووەوە و ئەيانەوێ بزماری ژەنگاويی ڕزيوی ماركسايەتی لە ڕۆژهەڵاتـەوە بۆ بهێنن و پينەوپەڕۆی بكەن .

## دووری مارکسایەتی لەگەڵ واقیعی کۆمەڵی ئادەمیزاد:

وەنەبێ مارکسایەتی تەوژمەکەی جارانی لە جیهاندا مابێ، کاتێ کە بۆیان دەرکەوت هەموو نەخشەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و (سۆشیالیستی زانیاری) مارکسی لە جیهانی ئەندێشەدا دارێژراون زۆر دوورن لەگەڵ واقیعی کۆمەڵی ئادەمیزاداندا، لەبەرئەوە هەر ئەو وڵاتانەی خۆیان بە باوکی مارکسایەتی دائەنێن، پاشەوپاش لێی کشانەوە و دەستیان دایە سمارتە لێدانی و بە برپەنگ تێی بەربون، بۆ نموونە:

کاتێ کە ڕوسیا خاوەنێتی خۆی (الملكية الفردية)ی هەڵوەشاندەوە و هەنگاوی کۆمۆنستییانەی نا، لەو کاتەدا خەڵکی سەیریان کرد چەندە خۆیان ماندوو بکەن و ئارەق بڕێژن، هەر ئەو مووچە و مانگانەیە بۆیان براوەتەوە هەر ئەوەیە، لێرەدا دەستیان دایە تەمبەڵی و خۆشاردنەوە لە کارە گرانەکان، خۆ لە یاسای سۆشیالیستیدا دەوڵەت بە پێی پێویست شتومەکی پێویستی بۆ ئامادە دەکات، ئیتر بۆچی خۆی بکوژێت و خۆی ماندوو بکات، لێرەدا هەرکەسە هەوڵ ئەدا کام فرمانەی ئاسانە ئەوە بکات و لە کارە گرانەکان خۆی بشارێتەوە، ئەم دیاردەیە بەشێوەیەك تەشەنەی کرد، هەتا میری لە ساڵی ١٩٣٦ دا بڕیارێکی دەرکرد و ڕێگای گەشەکردن و پەرەپێدانی ماڵداریی

خۆی دا، دروشمی مارکسایەتی ( هەر کەسە بە پێی توانای و بۆ هەر کەسەش بەپێی پێویست ) یان گۆڕی بۆ ( هەرکەسە بە پێی توانای بۆ هەر کەسەش بە پێی کارکردنی و هەرکەسە کار نەکات مافی خواردنی نییە )(١).

لۆمەیشیان ناکرێ، چونکە ئەگەر بە ڕاستی سەیری نەخشەی مارکسایەتی بکەین، بۆمان دەرئەکەوێت (میثالیەکی) ڕووتەو لە جیهانی ئەندێشەدا نەخشەی کێشراوە، سەیر ئەکەین داوا ئەکەن کە هەموو ڕواڵەتێکی ژیان بگۆڕێ لەسەر نەخشەی (حزب) پارت سەرلەنوێ جیهانێکی تر و شارستانیەتێکی تر و ڕواڵەتی کۆمەڵایەتییێکی تر و ڕواڵەتێکی ژیانی تر بکێشرێت و دروست بکرێت، ئەمەش بە چەند قۆناغێکی دیاری کراودا تێپەڕ بکات، لە قۆناغی یەکەمدا هەرچی ڕواڵەتی سەرمایەداری هەیە تەفروتونا بکرێت و میری (حزب) دەست بگرێت بەسەر هەرچی هۆکانی بەرهەم (وسایل الانتاج)و هۆکانی راگەیاندن (وسائل الاعلام) هەیە چ ڕۆژنامە و چ کتێب و چ ئێزگە و... هتد.

---

[1] گۆڤاری ( الرسالة الاسلامية )ی عێراق، ژمارە ١٠٦، ساڵی ١٩٧٧.

بۆ هیچ کەسـی تـر نـەبێت هانا هەڵبێنێتـەوە، بەتایبـەتی ئەبێ ئـایین و ڕەوشـت لـە گۆڕەپـانێکی گـەورەدا سـێدارەیان بـۆ هەڵبخرێت، لە قووڵترین گۆڕدا بنێژرێن(٢).

چـونکە لای مـارکس خـوا (الله) بریتییـە لـە بتێـك و دەوڵەمەندەکان تاشیویانە بۆ ئەوەی هـەژارەکان خـەریك بکـەن بـە پەرستنیەوە و سەرخۆشیان بکەن و بێئاگایان بکەن، ئـەمانیش، دەوڵەمەنـدەکان دەم بخەنـە خوێنەکـەیان و دەسـت بکەنـە مژینی(٣).

لە دوای ئەم قۆناغە، چینی کرێکار بەشێوەیەکی کاتی، باڵی دیکتاتۆریـەتی خـۆی بەسـەر گەلـدا ئەکێشـێ و ئـەم قۆنـاغـە پێـی ئەوترێ قۆناغی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا. ئەمجا کە هەموو سەر زەوی تەخت بوو و چینایەتی تێدا نەما و بوو بە ماستی مـەیوو بۆیـان و کۆمەڵگایـەکی یەکسـان دروسـت بـوو، دیکتاتۆریـەتی پرۆلیتاریا خۆی ئەتوێنێتەوە و ئیتر نە میری ئەمێنێت و نە یاسا

---

[٢] لماذا رفضت الماركسية، د. مصطفى محمود.

[٣] بۆیـە کـە شۆڕشـی بەڵشـەفی لـە رووسـیا دروسـت بـوو، باجیـان هـەڵگرت بـۆ رووخاندنی مزگەوت و کڵێسـەکان و تەنووریان داخست بۆ پـەڕەکانی قورئان و ئینجیل، بە ناپەسەندترین شێوە ملی زاناکانی ئایینی کران بە پەتـەوە و دەرسی ئایین لـە قوتابخانـەکانی ڕوسـیا هـەڵگیرا و دەرسـی ئیلحـاد و مارکسـایەتی درا بەسەر قوتابییەکاندا، لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا.

و نە دەوڵـەت، مرۆڤ پێویستی بەمانە نامێنـێ و ئیتر بەرهەم بە لێشاو ئەڕژێ بەسەر خەڵکیدا، ئەو کاتە هەرکەسە بە پێی توانای خۆی کار دەکات و هەر کەسەش بە پێی پێویست شت و مەك هەڵدەگرێت و لەمەودوا قۆناغی کۆمۆنیستییە.

ئـەم نەخشـەی مارکسـایەتییە . دای ناوە ئـەتوانین نـاوی بنـێین (وڕاوە)و ئایدیالی و میثالی و زۆر شتی تر لەم بارەوە، چونکە:

١. ئەو خەڵکانەی کە ئەم نەخشەیان بۆ دانراوە، ئەبێ ئادەمیزاد نەبن، یان فریشتە بن، یان نەتەوەیەکی جیاواز بن لـە مەریخەوە هاتبنـە خـوارەوە، ئـەگینا هـەتا گـرۆی ئـادەمیزاد مـاوە، خۆشەویستی دارایی هەر ئەمێنێ، بەتایبەتی کاتێ مرۆڤ باوەڕی بـە خـوا نـەما و چـاوەڕێی پاداشـتی پاشـەڕۆژی نـەما، چاوچنۆکترین مرۆڤ دەرئەچێت، ئەگەر ئایین نەمێنێ ئەبێ چی هـەبێ پـاڵ بـە ئـادەمیزادەوە بنـێ بـرا هاونیشـتمانییەکەی و هاومرۆڤایەتییەکەی لە خۆی خۆشتر بوێت(٤) ؟

تـەنیا ئایینـە گـەورەترین وزەی لـەخۆبردن و فیـدارکاریی لـە ئادەمیزاددا دروست بکات، کاتێ مارکس و هاوڕێکانی مارکس ئایینیـان لـە ئـادەمیزاد وەرگرتـەوە و لـە مۆزەخانـەی

[4] تەنیا ئایینە کە ئەفەرموێ: ( لا یؤمن احدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه ) صدق رسول الله.

کۆنەپەرستییان دایان نا، هەر نەخشەیەکی تری لێبووردن بۆ ئادەمیزاد دابنێن، نەخشەیەکی ئایدیالی پوچەڵە، مارکسایەتی کەوتۆتە تەنگەبەران و دژایەتییە، بە پلیشانەوە نەبێت کۆتایی نایەت، چونکە مارکسایەتی بیروباوەڕێکە داوای لەخۆبردن و بەخشین و خۆنەویستی لە خەڵکی ئەکات لە لایەکەوە و لە لایەکی ترەوە ئایینی لێ ئەستێنێتەوە.

کاتێ لەشکری نازی هێرشی بردە سەر ڕوسیا و ئابڵوقەی شاری (ستالینگراد)ی دا (ستالین)ی سەرۆك سەیری کرد هیچ شتێك نییە پاڵ بنێت بە جووتیارەکانی ڕوسیاوە بۆ قوربانی و لەخۆبردن، ڕۆڵەی ڕوسی نەیئەزانی بۆچی بمرێت و لە پێناوی چییدا خۆی بدا بە کوشت!!

خۆ کە مرد تازە ناگەڕێتەوە و زیندووبونەوە و بەهەشت و ڕێزی شەهیدیش نییە، چونکە ماددییەکەی مارکس وای پێوتووە و ئیتر چی هەیە پاڵی پێوە بنێ بۆ قوربانی، هیچ چارە نەمابوو بۆ ستالین ئەوەنەبێ دەست بداتەوە کردنەوەی مزگەوت و کڵێسەکان، بەڵکو دڵە مردووەکان زیندوو بکاتەوە(٥)

دووجار فەرمان دەرچوو بۆ هەموو شانە حزبییەکان، پێیان ڕاگەیەنرا کە هێرش بۆ سەر ئایین مەبەن، باسی خوا بە خراپە

---

٥ لماذا رفضت الماركسية، د. مصطفى محمود، ص١٣.

مەکەن، هەقتان بەسەر شتە نادیارەکانەوە (الغيبيات)ەوە نـەبێت، ئەگەر ئەو باسەتان لا کرایەوە بڵێن ئەو مەسەلە باسـی نـەکراوە و کاتی نەهاتووە، بەمەیشەوە ڕانەوەستان، بەڵکو پاش ماوەیەك دیمان چۆن (حجاج)ی ڕوسی لە مۆسکۆوە بەرەو مەککە هاتن (مفتـی ئیسـلامی) لـە ڕوسـیای شـیوعییەوە (فـەتوا)ی دەرکـرد ئەمانەش هەمووی پڕکردنـەوەی ئـەو کەلەبەرەیـە، بەڵام هـەتابێت گەورەتر ئەبێت.

٢. کاتێ کە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا باڵی بەسەر گەلدا کێشا و ئایین نـەما و ڕەوشـت زیندەبەچاڵ کـرا، ئـەو کاتـە دێوێك پەیـدا ئەبێت و ناوی ئەنرێت (بیرۆقرافی) جا ئەو سامانەی کە جاران سـەرمایەدارێك ئەیـدزی، لـەم کاتـەدا سوپایەکی دز پەیـدا ئـەبێ، هـەر لـە بەڕێوەبـەری (الجمعيـة الاسـتهلاكية) و کاربەدەسـتەکانی هـەتا سـەر فرۆشـیار، ئەبنـە بێـژنگێك و ئـارد و ئـاوی گـەلی پـێ ئەگوێزنـەوە، کەواتـە ئەمـە گواسـتنەوەی گەلـە لـە سـتەمێکی چینایەتییەوە بـۆ سـتەمێکی تـری چینایەتی و هـەر لـە یەکـەم هەنگاوی سۆشیالیستی، بە چاوی خۆمـان دیمـان پـەلامار درایـە بـەر بەخشـینەوەی خـەڵات و بەخشـش (جـائزة ومكافـأة) کـە ئەمانەش وزەی ناوخۆی مرۆڤ ناتەقێنن، بەڵکو بریتین لە بەرتیل و بەرتیلیش هەڵپەیـەکی پووکەشـی نـەبێ هیچـی تـری لـێ سـەوز

نابێت، ئەوەی کە وزەی ناوخۆیی ئەتەقێنێت، باوەڕە بە ڕۆژی پاداشت و پەیڕەوی شەریعەتێك بە یەك چاو سەیری کاربەدەست و ژێردەست بکات.

٣. مارکسایەتی وائەزانێ کە سێ ژەمی خواردن و بەرگ و دەرمانی پێویست درا بە مرۆڤ، ئیتر ئەو مرۆڤە سەرلەبەری ژیانی تەواوە، پێشینان وتوویانە: مرۆڤ تەنیا بە نان ناژێ، هەموو مرۆڤێ بە تەنیا لە دایکبووە و بەتەنیا ئەمرێ و بە تەنیا نەخۆش ئەکەوێ و بە تەنیا پیر ئەبێ و هیچ کەسێ هاوبەشی ئێش و ئازارەکانی ژیانی و برینەکانی ناکات، ئەو مرۆڤە لێی ڕوونە بۆیە لە دایکبووە بۆ ئەوەی بمرێت، دەبێ ڕێگای بدرێت پێش ئەوەی بمرێت زووخاوی دڵی هەڵبڕێژێت، چونکە مرۆڤ گیانداریکی سەربەستە و خاوەن بیر و هەست و هۆشە خۆی پاشەڕۆژی خۆی دیاری ئەکات هەندێ جار خواردن ئامادەیە، بەڵام ئەو برسێتی هەڵئەبژێرێ و بە ڕۆژوو ئەبێت، یان لە جەنگێکی خۆکوشتنەوە (انتحاری) دا بەشداری ئەکات و لێی ڕوونە کە ئەمرێت، جارێکی تر چاوی بە ڕۆشنایی جیهان ناکەوێت، کەچی ئەو مردن هەڵئەبژێرێت لە پێناوی ئەوەی کە وتوویەتی، نا، نا، ڕووبەڕووی ستەم، نا بەرەو ڕووی هەر شتێ دژی قەناعەتی کەسایەتی بوەستێ.

٤. ئـەو هـەموو كرۆزانـەوەی كـە مـاركس كرۆزاوەتـەوە بـۆ چینی كرێكار، لەگەڵ گیانی زانیاریی ئێستا و پێشكەوتنی شۆڕشی تەكنەلۆژیـدا ڕێـك ناكـەوێت، بـە بیرێكـی كۆنـە ئەدرێتـە قەڵـەم، چونكە لە كاتی ماركسیدا كرێكار هـەموو كارەكانی بـە دەست ئەكرد و ئـەو دەستكەوتەی بـەو ئارەقـە و ماندووبونـەی پەیـدای ئـەكرد، بەشـی گـوزەرانی نەئـەكرد، جگـە لـەوە كرێكـار ماندووترینی چینی گەل بوو، بەڵام ماركس نەیزانیوە لەمڕۆی ئێمەدا كرێكار لەسەر كورسییەك دانیشتووە و چەند دوگمەیەك لەبەردەمیدایە و هەموو كارەكانی بە ژیریی ئەلیكترۆنی ئەكات، ئەو كرێكارە چەوساوە بەشخوراوەی ماركس بیری لێ كردۆتەوە، ئێستا نـەماوە و تەنانـەت لـە وڵاتـە سەرمایەدارەكانیشدا ئێستا كرێكار خاوەن بەشە لە كارگەكاندا و نیقابـە و یـەكێتی كرێكاران بە هەموو هێزێكی پشتیوانی ئەكات، هەركاتێ مان بگرن دەوڵەت ئەكەوێتە پەلەقاژێ(٦).

٥. هۆی سەرەكی ڕووخاندنی ماركسایەتی ئەو دروشمە بوو كـە لـە سـەرەتای هـەموو دروشمەكانـەوە هەڵیانواسـیبوو، لێیـان نوسیبوو..... (ئایین تریاكی گەلانە)

---

[٦] كتێبی (الماركسیة والاسلام) د. مصطفی محمود، چاپی دووەم، ل١٢.

## ئایین تریاکی گەلانە:

ئایین چەکی دەستی دەوڵەمەندانە بۆ هەژاران، ئەگەر بمانەوێ ڕاستی و ناڕاستیی ئەم دروشمە مارکسایەتییەمان بۆ دەرکەوێت، پێویستمان بە خۆماندوو کردن نییە، تەنیا بە تاقە پرسیارێك بۆت دەردەکەوێ، ئایا دەوڵەمەندەکانی قورەیش پاڵپشتی موحەممەد (ﷺ) بون لە داخوازییەکەیدا یان ڕەش و ڕووت و هەژارەکان؟ ئایا پێشمەرگەکانی ئیسلام و پەروانەکانی دەوری موحەممەد (ﷺ)ئەبوجەهل و عوتبە و بۆرجوازییەکانی قورەیش بون؟ یان بەندە و چەوساوەیەکی ژێردەستی دەوڵەمەندەکان بون؟

ئەگەر ئیسلام داری دەستی دەوڵەمەندەکان بوو، بۆچی دەوڵەمەندەکان بەربەرەکانێیان ئەکرد و هەژارەکان قوربانییان ئەدا؟ بەلام وا دیارە مارکسی هەژار هیچی لە ئیسلام نەخوێندووەتەوە، لە ڕوانگەی جولەکایەتییەوە بڕیاری خۆی دەرکردووە، خۆ ئەگەر سەیرێکی سەرپێیی مێژووی گەلانی موسڵمان بکەین، بۆمان دەرئەکەوێت هەرکاتێك ئایین گیانی قوربانی و فیداکاری بۆ نیشتمان و گەل دروست کردووە لەناو گەلە مووسوڵمانەکاندا و لاوەکانی پاڵ پێوە ناوە بۆ سەنگەر گرتن.

ماركس هەرچی نوقلانه (تكهن) یەكی لێداوه له هەموویدا به درۆ كەوتۆتەوه و بۆ نموونه وتی:

كۆمۆنیستی لـه كۆمەڵگایـەكی پیشەسازیی سـەركەوتووی وەكو ئەڵمانیا و ئینگلتره سەرهەڵ ئەداو گەشه ئەكات، هەروەها له ساڵی ١٨٤٩دا وتی كۆماری سوور لەسەر ئاسمانی پاریسدا له ئاسۆ دەردێت، كەچی وانەبوو(٧) .

بەڵكو لـه كۆمەڵگایـەكی كشتكار و دواكـەوتووی وەكو چین سەری هەڵداو وتی(٨):

دژایەتییـەكی زۆر تونـد لـه نێـوان بۆرجـوازی و پرۆلیتـاری و سۆشیالیسـتی و سـەرمایەدارییدا دروسـت ئـەبێ، هـەتا لـه ئەنجامـدا شۆڕشـێكی گـەوره دروسـت ئـەبێ و ڕووی جیهـان وەرئەچـەرخێنێ بـەرەو كۆمۆنیسـتی، كەچـی وانـەبوو، بـەڵكو سـەرۆكەكانی (كـرملین)ی ڕوس لەگـەڵ سـەرۆكەكانی كۆشـكی سـپی ئــەمریكی كۆئەكەینــەوه و وتوێــژی خۆشەویســتی ئەگۆڕنــەوه، بــەڵام سـەربازی (چـین)ی شـیوعی ڕووبـەڕووی سـەربازی ڕوسـیی شـیوعی لـه سـەنگەردایه، جگـه لـەوەی بیرەوەریـی تواندنـەوەی چینی پرۆلیتـاری پـاش ئـەوەی بـاڵی

---

[٧] الاسلام يتحدى، ل١٢٨.

[٨] لماذا رفضت الماركسية، د. مصطفى محمود.

ڕەشی کێشا بە سەر گەلدا، هەڵەترین بیرەوەری مارکسایەتییە، تـازە ئـەو پرۆلیتاریيانـەی بـەناوی حزبـەوە گـونی گونـدار دەرئەهێنێ و هەرکەسێ پێچەوانەی فەرمانەکانی بکات پولێکی سۆشیالیستی پێوە ئەنێ و ڕەوانەی یەخچاڵەکەی (سیبریا)ی دەکات، تازە ئەو لە پۆپەی دەسەلاتەوە بە خۆشی سەری خۆی دێتە خوارەوە دەسەلاتەکەی و چینەکەی ئەتوێتەوە.

کەواتە گێژوگولێکی . سۆسیالیستی زانیاری . و دیالێکی زانیاری، تەنیا بەرگێکی بێ ناوەڕۆکە بۆ فرۆفیتی بیروباوەڕە ڕووخاوەکەیان .

**بەدرۆخستنەوەی دروشمی مارکس بەرامبەر ئیسلام :**

تـو خـوا بـۆ نـاڵێن بـە مارکسـییەکان کـێ لـە سـەرەتای دروستبونی بونـەوەرەوە هـەبووە و بزانـێ کـە سـەرەتای بونـەوەر تەنیا ماددە بووە و پێویستی بە هیچ هێزێك نەبووە ؟

پرسیارێکە یەکەم بەردی بناغەی مارکسایەتی ئەلەقێنێ، ئەگەر ئێمە ئەڵێین تیۆرە، ئێمە ئەڵێین گومانە، فەرموو با بیچەسپێنێ، هەرچەندە ڕوسیا و چین و یوگسلاڤیا و ... هتد

هیچیان خاوەنی شارستانیەتی، تەنانەت بیروباوەڕی خۆیان نین و کاتـێ مـن ئـەڵێم ئێمـەی مووسـوڵمان بڕوامـان بـە سـەربازگەی سۆشیالیسـتی و سـەربازگەی سـەرمایەداری نییـە و بـەڵکو هەردووکیان بە یەك سەربازگە و یەك شارستانی سەیر ئەکەین، چـونکە سـەربازگەی سۆشیالیسـتی لقێکـە لـە سـەربازگەی سەرمایەداری و نەختێك سمارتەی بلیمەتی جووەکانیان لێدراوە و شارسـتانی و هـەموو تەکنـەلۆژی ڕۆژهـەڵاتی سۆشیالیسـتی زادەی مێشکی ڕۆژئاوای سەرمایەدارییە، دۆزینـەوەی هێـزی بـە هەڵم بون، نەوت، کارەبا، ئەلیکترۆن، ئەتۆم، ... هتد

هەمووی زادەی مێشکی ئەورووپا و ڕۆژئاوان .

لەگـەڵ ئـەم هـەموو چـەپڵەیەی لـە کوردسـتاندا بـۆ بـەرەی سۆشیالیست لێ درا، ئێستاش هیچ خێر و خۆشییەکمان نەدی

لەم بەرەیە، بەڵێ میك و ناپاڵم و کوێرە بۆمبای ئاشتیخوازەکان، چەم و دۆڵ و شار و گوندی کوردستانیان ئاوەدان کردبووەوە، بەڵام ئاشتیخوازەکانی کوردستان و هەڵگرانی خەڵاتی (لینین لە ئاشتییدا) هێشتا تێریان نەخواردووە. ئەگەر بەرەی ڕۆژئاوا تاقە جارێك لە ساڵەکانی (۳۰)دا بۆردومانیان کردین، ئەمانە ئەشکەوتەکانی کوردستان بونەتە هێلانەی فڕۆکەکانیان، کەواتە کاتێ ئێمە باسی شارستانیەتی ئەوروپا دەکەین، هەڵی ئەسەنگێنین لەگەڵ شارستانێتی ئیسلامدا، مانای وایە شارستانیەتی ماددیەتمان بە هەردوو بەشەکەیەوە. ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی . هەڵسەنگاندووە، جا ئێستا بۆ ئەوەی بتوانین شارستانێتی ئەوروپا لەگەڵ ئیسلامدا هەڵبسەنگێنین، یان بڵێین شارستانیەتی ئەوروپا بە تەرازووی ئیسلام بکێشین، بزانین هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بەو شارستانیەتە چییە؟

ئەوەیشمان لە یاد نەچێ کە پلەی تێگەیشتنی ڕۆڵەکانی ئیسلام و زانایانی ئیسلام، ئەمڕۆ گەلێ جیاوازە لەگەڵ دوێنێ، ئەمڕۆ ڕۆڵەی مووسوڵمان پاش ئەوەی ماوەی چەواشەکردنی تەواو بوو، هۆشی هاتەوە سەر خۆی، ئێستا زۆر بە وردی ئەتوانێ هەر شتەی لە جێگای خۆی دابنێ، تازە ئەوە بەسەرچوو مەکینەیەکی جووتی ئەورووپی بێتە شارەوە ئیتر لاوەکانمان

هەموو نەریت و ئایین و ڕابوردوویەکی خۆیان لەبیر بچیٚ و بیٚ وردبونەوە کرنووش بەرن بۆ ئەم و ئەو، بەڵکو ئەمڕۆ ڕۆڵەی مووسوڵمان ئەزانیٚ کە بیروباوەڕی داگیرکەران جیایە لەگەڵ پیشەسازیدا و ئەو زانیارییە و تەکنەلۆژییەی بەری خەبات و قوربانی هەموو گرۆی ئادەمیزادە بە گشتی، لەبەرئەوە زانیاری بە جیا وەرئەگریٚ و بیروباوەڕی لە دەرەوە هیٚنرا و بە جیا و زۆر بە جوانی لە یەکتری جیا ئەکاتەوە، ئەگەرچی وەکو هەویریش پیٚکەوە بشیٚلریٚن. جا لەم پەڕاوەدا بەشیٚوەیەکی (موضوعی) شارستانیەتی ئەورووپی هەڵئەسەنگیٚنن، بۆ ئەوەی بتوانین لایەنەکانی چاکە و خراپەی ئەم شارستانیەتە جیابکەنەوە. تیشکی لیٚکۆڵینەوەمان چڕ ئەکەینەوە سەر خالیٚك، کە ئەویش هەڵسەنگاندنی گۆشەکان و پایەکانی ئەم شارستانیەتەیە لەگەڵ ئیسلامدا بۆ ئەوەی بزانین ئایا ئیٚمەی مووسوڵمان هەڵویٚستمان چییە بەرامبەر بەو شارستانیەتە ؟

ئایا هەر لە سەرەتاوە دەست ئەنیٚین بەڕوویەوە و بەسەروبەرەوە دەرگای لیٚ دائەخەین؟ یان دەرگای بۆ ئەخەینە سەرپشت و باوەشی پیٚدا ئەکەین؟ یان گوڵبژاردەی ئەکەین هەندیٚکی هەڵئەبژیٚرین و هەندیٚکی فڕیٚ ئەدەینەوە بەسەر خۆیاندا و نامانەویٚ، ئەم هەڵسەنگاندنە بە شیٚوەیەکی (موضوعی) ئەبیٚ و

بە پشتیوانی خوا دوور ئەبێ لە هەموو شێوەیەکی دەمارگیری و خودویستی.

ڕۆژێك تێپەڕی بەسەر کوردستان و خوێنەرانی کوردستاندا کە دەمارگیری گەورەترین دەوری ئەبینی لە ژیانی خوێنەوارانداء زۆربەی ئەوانەی کە خوێنەرانی ئاین بون و دەرچووی قوتابخانەکانی مزگەوت بون (حجره)، دەرگایان لەسەر ئەم شارستانیەتە بە تەواوی داخستبوو، بە چاك و خراپیەوە، چوونە قوتابخانەکانی ئەکادیمییان بە (کفر و الحاد) ئەدایە قەڵەم... تەنانەت لە زۆر کەسم بیستووە کە فلانە مامۆستا یان فلانە شێخ فەرموویەتی دانیشتن لەبەر گڵۆپی کارەبا باوەڕ لاواز ئەکات، هەتا گەیشتبووە ئەو پلەیە کە مامۆستایەك ئەیفەرموو (مکتب) بەپێی ژمارەی (أبجد) ئەکاتە (منبع) سەرچاوەی کوفر[٩] ئەمەیان لەلایەکەوە. لە لایەکی ترەوە خوێندکارانی قوتابخانە ئەکادیمییەکان خۆیان ناونابوو (منور)، وەکو چۆن ئێستا خۆیان ناوناوە ڕۆشنبیر (مثقف)، بە قێزەوە سەیری ئاین و کەلەپوری نەتەوەی خۆیان ئەکرد و بە هەزاران ناو و ناتۆرە و وتەی سوکیان خستبووە دوای مەلا و خوێندکارانی ئاین. ئەم تەموژە سووککردنی پیاوانی ئاینی بەشێوەیەك بوو کە سووکترین پیشە

---

[٩] گۆڤاری بەیانی ژمارە ٣٦ حوزەیرانی ساڵی ١٩٧٥، پەراوێزی ١٥.

پیشـەی مەلایـەتی و فەقێیـەتی بـوو، تەنانـەت زۆر لـە پۆڵـەی مـەلاکانیش، ئەوانـەی بـە نانـە ڕەقـەی حـوجرە پـەروەردە بـون و دوایی لێی هەڵگەڕانەوە و لەگەڵ ئەو منەوەرانەدا کەوتنە سووك کردنـی ئـاین و پیـاوانی ئـاینی، هەنـدێکیان لـە ژێـر تیشـك و نەخشەیەکی دیاریکراودا کە لەلایەن دوژمنانی ئیسلامەوە بۆیـان کێشرا بوو. هەندێکیان لە خۆیانـەوە تووشـی ئـەو درمـە بون، بـۆ نموونە بێکەسی شاعیر ئەڵێت:(١٠)

هەردوو گوێم پڕبوو لە باسی وەعظ و سەرفیترە و زەکات
هــەر هەواڵی حـەشر و نـەشرم پێ دەڵێن تـاکو مەمات
بـەسە لـەومەوضوعـە لادە ،فیـڕی نـوێـژ بــوو کائینـات
خــوتـبـەیـەکی ئیجتیماعیم پــێ بـڵـێ بــۆ ڕێـی حەیـات
ئـــەی مــەلا تــوبــی خــودا لــەم فیـکـرە کــۆنـە لابــدە
فــەننی تـازەم پــێ نیشانـدە بۆ تــەرەققی وڕێی نـەجات

یـان هـەژاری شـاعیر کـە باسـی خوێنـدنی خـۆی و ئـەو هەسـتەی ئەکات کە پێشوازی قورئانی کردووە، ئەڵێ...(١١)

سوێندی کەسم لەسەر نییە هەر من خۆم کاتێ (جزمی عەمەم) دەخوێند و حینجەم دەکردەوە، کە لە سەر و سیمای مامۆستام

---

[10] دیوانی بێکەس، محەمەدی مەلا کەریم، ل٦٤، ساڵی ١٩٧٠.

[11] گۆڤاری پەروەردە و زانست، ژمارە ١، ساڵی ١، ل٣١.

دەترسام جگە لەوەی کە لە دیمەنی قامچی و دار لەرزم لێ دەهات، زۆرجار وشەی دەرسەکانیشم لێ دەبونە مار و دووپشك و خەریك بوو لە ترسان فەراقی ڕەش بکەم. بۆ نموونە هەر لە خۆمەوە لە . عەین واوعو(۱۲) . لە ترسا لام وابوو جنۆکەی لێ دەردەپەڕێ. ئای کە ڕقم لە بیل فەلەق(۱۳) هەڵدەستا، زیل الجنە(۱٤) و ئەلخەن(۱٥) بوو بونە دوژمنی خوێنم و حەزم دەکرد بیان خنکێنم.(۱٦)

ئەمە ڕۆژگارێك بوو تێپەڕی، لۆمەشیان ناکرێ؛ چونکە بەرەی یەکەم داگیرکەر ترساندبوویانن زاراوەی هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە دەمیاندا بوو، ترسی داگیرکردن بە شێوەیەك بەسەریاندا زاڵ بوو بوو نەیان دەوێرا لایەنەکانی ئەم شارستانیەتە لە یەکتری جیابکەنەوە و گوڵبژاردەی بکەن یەکسەر دەرگایان لەسەر داخست و فتوای دژوارییان دژی دەرکرد .

---

[۱۲] مەبەستی لە . قل اعوذ.

[۱۳] مەبەستی لە ـ قل اعوذ برِّب الفلق ـ ە.

[۱٤] مەبەستی لە ـ من الجنة ـ هەر ئەوەندەی فێر بووە.

[۱٥] مەبەستی . الخناس . ە.

[۱٦] هیچ ناڵێم چونکە.....

بـەرەی دووهــەمیش (منورەکـان)، کـە سـەیری ئـەوروپا و شارسـتانیەتی ڕۆژئاوایـان ئـەکرد، وەك دێوێـك ئەهاتـە پـێش چـاویان و ورەیـان بـەردابوو، وایـان ئـەزانی هەرکەسـێ خـۆی هەڵنەواسێ بە کلکی ئەو دێوەدا، لە ژیان و پێشکەوتن بەشبڕاو ئەبێ. بەڵام ئەمڕۆ تەپوتۆزی مێژوو ئەو لاپەڕەیەی داپۆشی و بە لێزمەی ئاوی ترسشکاندن ئەو لاپەڕەیەش شۆرایەوە. بەڕای من ئەو ڕۆژە هاتووە کە بتوانین ئەو شارستانیەتە هەڵسەنگێنین و تەرازووی ژیری ئامادە بکەین و بەپێی سەنگمان و بیروباوەڕمان و ڕێبازی ژیـانی ڕاستەقینەی مرۆڤایـەتیمان، بیکێشین و نرخـی شیاوی خۆی بدەینێ. ئەمانەوێ بزانین ئایا ئەم شارستانیەتی لە ئـەمڕۆدا خێـری تێدایـە؟ یـان شـەڕی تێدایـە؟ یـان خێـر و شـەڕ هەردوکیانی تێدایە؟ ئایا ئەتوانین هیچی لێوەربگرین؟ با بزانین.

## پایەکانی شارستانی :

هـەموو شارسـتانیەتێك لـە شارسـتانیەتەکانی کـۆن و نـوێ و سـەرکەوتوو و ڕووخـاو و ئیسـلام و کـافر، لەسـەر ئـەم پایانـەی خـوارەوە دارێـژراون و هـەر شارسـتانیەتێك یـەکێ لـەم پایانـەی ناتـەواو بـێ، بـە شارسـتانیەتێکی ناتـەواو ئەدرێتـە قەڵـەم، ئـەو پایانەش:

١. چۆنیەتی بیروباوەڕ ـ عقیدە ـ ی ئەو شارستانیەتە.

٢. یاسای ئەو شارستانیەتە (النظام).

٣. چۆنیەتی بیرکردنەوەی ئەو شارستانیەتە (تصورات).

٤. ڕەوشتی ئەو شارستانیەتە (أخلاق).

٥. پلەی زانیاری لەم شارستانیەتەدا (العلم والتکنولوجیا).

٦. چۆنێتی ڕێکخستنی ئیدارە (التنظیم).

ئـەم شـەش پایـە شـێوەی شارسـتانیەتی هـەموو گـەلێ نیشـان ئەدات، هـەرکاتێك بمانـەوێ هـەر شارسـتانیەتێك هەڵبسـەنگێنین، ئەبێ لـەم شـەش ڕووەوە هـەڵی بسـەنگێنین، جا ئەگـەر لـە هـەموو ڕووەکانیـــەوە سەربەســـەر دەرچـــوو، ئـــەوە شارســـتانیەتێکی سەرکەوتووە، خۆئەگەر لە چەند ڕوویەکـەوە، یان لـە ڕوویەکـەوە ناتـەواو بـوو، ئـەو شارسـتانیەتە سـەرکەوتوو نـابێ و بـەرەو ڕووخانـدن ئـەڕوات، هەرچـەند بـەهێز و دەوڵەمەنـد بـێ. جـا

ئێستاش پێش ئەوەی بێینە سەر شارستانیەتی ئەورووپی و هەڵسەنگاندنی پایەکان و ڕووەکانی لەگەڵ ئیسلامدا. پرسیارێك قیت ئەبێتەوە و خۆی بەسەر باسەکەماندا ئەسەپێنێ و چاوەڕێی وەڵام ئەکات ئەویش ئەوەیە ئایا ئێمەی موسڵمان بۆمان هەیە هیچ شتێ لە کافر وەربگرین، ئایا قەدەغە نییە شت وەربگرین لەو گەلانەی موسڵمان نین ؟

چونکە ئەگەر قەدەغە بێت و بۆمان نەبێ، بۆچی خۆمان ماندوو بکەین و شارستانیەتی خەڵکی هەڵبسەنگێنین، نەخێر هیچ قەدەغە نییە و بۆمان هەیە هەرشتێ بەربەرەکانێ لەگەڵ بیروباوەڕ و نەخشەی خواکەماندا نەکات، تەتەڵەی بکەین و ئەوەی بۆ ڕۆژانەی ژیانمان بەسوودە و هۆی پێشکەوتنمانە، لێی وەربگرین.

چونکە مسوڵمانە پێشووەکانیش کەڵکیان لە کەلەپوور و میرات و شارستانیەتی فارس و ڕۆم و یۆنانی و چین و هیندی وەرگرتووە، مووسوڵمانەکانی نیوەدورگەی عەرەب و لە سەرەتای ئیسلامدا، هیچ پلەیەکی زانیارییان نەبوو لە هەموو ڕوویەکی ژیاندا و دواکەوتوو بون، بەڵام پاش ئەوەی خوا کردنی بە دەوڵەت و قورئانەکەیان فەرمانی بۆ دەرکردن کە ئەبێ خوێندوار بن و ئەبێ سەرزەوی لە هەموو ڕوویەکەوە ئاوەدان

بکەنەوە، فەرمانی بۆ دەکردن کە ژیرییان و دڵیان گوێ قوڵاخ بوەستێ بۆ هەموو دەستکەوتێکی زانیاری پێش خۆیان و ئەمانیش قووڵتر و فراوانتری بکەن، ئەوەبوو قوڵی گۆڕین . ترجمە . یان هەڵکرد و هەر زانیارییەکی ئەو سەردەمە بەکارهاتبێ، بە گورجی وەریانگێڕاوەتە سەر زمانەکەیان و لە زانکۆکانی .
( نظامیة، مستنصریة، أزهر، أندلس ) دا خوێنران، کەواتە ئێمەش بۆمان هەیە لە شارستانیەتی ئەوروپی و هەموو شارستانێتییەکی تر شت وەربگرین و بیکەینە وزە بۆ قافڵەی تێکۆشانمان، بەو مەرجەی بزانین چۆن وەری ئەگرین و چی وەرئەگرین.

## ڕواڵەتی یەکەم / بیروباوەڕ ( عقیدە ):

مەبەستمان لـە بیروبـاوەڕ، هەڵوێسـتی مرۆڤـە بەرامبـەر ئـاین، فەیلەسوفی فەرەنسی ـ برگسۆن ـ ئەڵێ ( لـە دێرینترین ڕۆژگاری مێـژووی ئـادەمیزادەوە هـەتا ئـەمڕۆ، گـەلێ کۆمـەڵ هـەبووە و ئێستاش هەیە، کە بێبەش بون لە زانیاری و هونەر و فەلسەفە، بـەڵام هـەرگیز مێـژوو گـەلێکی بـە خۆیـەوە نـەدیوە هـیچ جـۆرە ئاینێکی نەبووبێ ).(١٧)

کەواتـە دیـارترین ڕووی هـەر شارسـتانێتییەك بریتییـە لـە هەڵوێسـتی ئـەو شارسـتانیەتە بەرامبـەر ئـاین، شارسـتانیەتی ئەورووپا بە گشتی، لەسەر بنچینەی بێ بڕوایی دانراوە و خۆیـان وا پیشـان ئـەدەن کـە زانیـاری تـازە لەگـەڵ وشـە ی ـ خـوادا لەسەنگەرێکی بەرامبەر یەکتردا بن، بە هیچ جۆرێ ڕێگای وتووێژ نییـە لـە نێوانیانـدا، چـونکە بناغـەی بیرکردنـەوەی مـاددە و وردکردنەوەی ماددە و ناسینی ماددەیە، خۆ خواش ماددە نییە، کەواتە لە تای شایەنی ئەواندا جێگای بۆ دانانرێ، ئەمە ڕواڵەتی باوی شارستانییەکەیان، بەڵام ئەگەر گوێ لـە زاناکانیـان بگـرین، وتەی پرۆفیسۆرەکانیان لەم بوارەدا تەتەڵە بکەین، سەیر ئەکەین بەم شێوەیە نییە...

---

[١٧] العبادة في الاسلام، يوسف القرضاوي، ص١٦.

دکتـۆرێکی ئـەڵمانی کـە نـاوی (بـترس) بـوو، هەڵسـا بـە سەرژمێرییەکی ورد لە بارەی هەڵوێستی ئەو کەڵە زانایانەوە کە بەدیهێنەری شارستانیەتی ئەمڕۆی سەرزەوین بەرامبەر بە ئاین و بونی خوا، لە ماوەی ئەم چوار سەدەی دوایی، سەدەکانی (١٧، ١٨، ١٩، ٢٠)دا. لـە هەڵسـەنگاندنی هەڵوێسـتی (٢٩٠) زانـای هەرەبـەرز لەگـەڵ ئاینـدا، بـۆی دەرکـەوت کـە (٢٨)یـان نەگەیشتوونەتە هیچ ئەنجامێ لە بارەی بون و نەبونی خواوە، (٢٠) زاناشیان باوەڕیان بە خوا نەبوو یان گوێیان نەداوەتێ ببێ یان نەبێ، بەڵام (٢٤٢) زانایان هانای باوەڕ بە خوایان هەڵبڕیوە و لـە کتێـب و زانسـتەکانیاندا ئاشـکرایان کـردووە کـە بـاوەڕی تـەواویان بـە خـوا هەیـە کەواتـە ئەگـەر سـەیری ڕێـژەی زانـا باوەڕدارەکانی شارستانیەتی ماددیەت بکەین، لەگەڵ ڕێژەی زانا بێ باوەڕەکاندا، زانا باوەڕدارەکان لە چاو بێ باوەڕەکاندا، لە (٩٢٪)ی زاناکان خاوەنی باوەڕن.(١٨)

---

[18] العلم ليس كافراً. د. محسن عبدالحميد. ص١٠.

کـــافربونی ئـــەوروپا و زۆربـــەی زۆری مووســـوڵمانەکانی لای خۆشمان بەخۆڕایی نییە ، بەڵکو چەند هۆیەکی کوشندە هەیە کە پەردەی ڕەشی داوە بەسەر چاویاندا لە هەموو ڕاستییەك ڕاستتر کە خوا نابینای کردوون، هۆکانیش:

١/ ناڕاستی سەرچاوە: فەیلەسوف و نووسەری هاوچەرخ (کارل یاسپرز) لە کتێبی (مدخل الی الفلسفه)[١٩] ، دا ئەڵێ: دەربارەی بونی خوا، لای ئێمەی ڕۆژئاوایی دوو سەرچاوەمان هەیە بۆ پشکنین بە دوای خوادا و ڕوونکردنەوەی باوەڕ بە خوا، ئەو دوو سەرچاوەیەش بریتین لە ئینجیل و فەلسەفەی یۆنانی، جا ئەگەر فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا لە ڕوانگەی ئینجیلەوە بڕوانن بۆ خوا، ئەبێ چ خوایەك بەدی بکەن. خوایەك کە زاوزێ بکات و منالی ببێ و خوایەکی بێ دەسەڵات، کوڕەکەی بکوژن و هەڵبواسن نەتوانێ ورتە بکات، خوایەك لەبەر خەفەتی مەریەمی خێزانی و عیسا و هەموو بونەوەری لەبیر بچێ. یان ئەگەر فەیلەسوفێ لە ڕوانگەی فەلسەفەی یۆنانییەوە بڕوانێتە بونی خوا، چەندین خوا هەن، ئەوە خوای وشکانییە و ئەویتر خوای جوانییە و ئەویتر خوای دەریایە و ... هتد. کۆمەڵە خوایەکی بێ سەر و بن نەبێ خوایەکی دەست ناکەوێ مرۆڤ دروستی نەکردبێ، کاتێك ئەو

---

[١٩] ل٨٧، گۆڕینی د. محمد فتحی الشنقیطي.

فەیلەسوفە ئەم جۆرە خوایانەی بەدی ئەکات، هەقی خۆیەتی کە بڵێ: خوا مرۆڤی دروست نەکردووە، بەڵکو مرۆڤ خوای دروست کردووە، خۆ ئەگەر ئاوڕێك بەلای تەوراتدا بدەینەوێ بمانەوە و خوایەکمان دەست بکەوێ کە شیاوی پەرستن بێ و بتوانین نازناوی دروستکەری بونەوەری بەسەردا ببڕین، ئەگەرچی بەزۆریش بێت، ئەو خوایەی کە تەوراتە دەست لێ دراوەکەی ئێستا باسی دەکات، هەرگیزاوهەرگیز ژیری و زانیاری نە بە خوای دائەنێ و نەشیاوی پەرستنیشە ئەو خوای کە تەورات باسی ئەکات:

أ. ڕەگەزپەرستە:(٢٠) حەلاڵی کردووە بۆ خەڵکی (شعب الله المختار) شتومەك بە ـ سوو ـ (ربا) لە هەر نەتەوەیەکی تر جگە لە (جوو) وەربگرێت، بەلام نابێ جولەکە لە نێوان خۆیاندا سوو (ربا) هەبێت.(٢١)

ب. ئەو خوایەی کە تەورات باسی ئەکات پێویستی بە پشوودان (استراحة) هەیە و ئەخەوێ و لە خەو هەڵدەستێ، لە ماوەی شەش ڕۆژدا زەوی و ئاسمانی دروست کردو لە ڕۆژی حەوتەمدا

---

[٢٠] التوراة د. مصطفى محمود، ص٤٧.

[٢١] التوراة، نشينة، ص٢٣.

ئیسـراحەتی کـرد و پشـووی دا و دوا هەناسـەی ئاسـوودەیی هەڵکێشا. (الخروج ۳۱).

"وسبێ ئەی ئادەمیزادەکان، ئەوا خوا هات و هەڵسا لە خەو، دەرچوو لە یانەی پیرۆز" زکریا الاصحاح (۲)

ج. خـوا پەشـیمان ئەبێتـەوە لـەو ئیشـانەی کـە ئـەیکات، پـاش ئەوەی کە لافاوی هەڵساند لـە کاتی (نوح)دا (سەلامی خوای لێ بێ) پەشیمان بوویەوە لە کارەکەی خۆی، هەڵسا ئەستێرە زێڕینەی دروست کرد و کردیە پەیامێکی یادخەرەوە بۆ ئەوەی جارێکی تـر هەڵـەی وا نـەکات و هـەرکاتێ ڕقـی لـە هـەر گیانلەبـەرێکی سـەرزەوی هەڵسـا، بـەو ئەسـتێرە زێڕینـەدا پەیمانەکـەی بـیر بکەوێتەوە.(۲۲)

د. هیچ پێغەمبەرێك بە بێوەی لە دەست تەوراتە کارتۆنییەکەی جوولەکە دەرنەچووە، نوح (سەلامی خوای لێ بێ) عارەق خۆر بوو، لـوط (سـەلامی خـوای لـێبێ) بـە سەرخۆشـی لەگـەڵ کچـەکانیدا رایئـەبوارد، یـەعقوب (سـەلامی خـوای لـێ بـێ) دزیـی ئـەکرد، هـوود (سـەلامی خـوای لـێبێ) لەگـەڵ بوکەکـەی، خێزانـی کوڕەکـەی، ڕای ئەبوارد، داوود (سەلامی خوای لێ بێ) دڵی چوو لە خێزانی ئەفسـەرە دڵسـۆزەکەی کـە نـاوی (ئۆریـا) بـوو سـکی ژنەکـەی پـڕ کـرد و

---

[۲۲] التکوین، الاصحاح، ۹.

مێردەکەی نارد بۆ جەنگ تا کوژرا، سلێمان (سەلامی خوای لێ بێ) لە کۆتایی ژیانیا دەستی دایە بتپەرستی، هاروون (سەلامی خوای لێ بێ) گوێرەکەی ئەپەرست پاش ئەوەی کە کرا بەپێغەمبەر، تەنانەت موسا(سەلامی خوای لێ بێ) لەگەڵ خوادا ڕاست دەرنەچوو، ناپاکی لەگەڵدا کرد..... هتد

هەموو پێغەمبەرەکان تاوانی زۆر ناشیرینی وایان بۆ دروست کراوە کە هیچ شەلاتییەکی ناو بازاڕ پێی ڕازی نابێ نەك ئەو پێغەمبەرە (مرسل)انە و هەڵبژاردانەی خوا بۆ مامۆستای ئادەمیزاد.(٢٣)

جا ئەگەر کتێبێکی ئاسمانی بەو شێوە باسی خوا و پێغەمبەرانی خوا بکات، کەی زانایانی سەدەی بیست ئەتوانن چێژی باوەڕی تێدا بچێژن و دڵیان ئاو بخواتەوە، دیارە کە خوایان دەست ناکەوێ، ئەو خوایەی کە کاروباری بونەوەری بەدەستەوە بێ و دروستکەری بونەوەر بێ نابێ بخەوێ، نابێ پێویستی بە پشوودان و ئیسراحەت هەبێ، نابێ شتی لە یادبچێ، چۆن ئەبێ ئەستێرە زێڕینە ببێتە سکرتێری خوا و شتی بیر بخاتەوە، هەر قوتابییەکی ناوەندی بیەوێت لە ماڵی

٢٣ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستییە، سەیری تەورات سفر صموئیل الثاني اصحاح، ٢٣ و کتێبی التورات . د. مصطفى محمود، ص٦١. ٦٢ بکە.

خۆیـدا بـە شـکاندنەوەی تیشـکی ئـەتوانێ بـە چـەند پارچـە شووشەیەك ئەستێرە زێڕینە دروست بکات، کەواتە نە ئینجیل و نە تـەورات نـە فەلسـەفەی میسـالی کۆن، هیچیان ناتوانن ڕێگـای چوونە لای خوا پیشانی خەڵکی بە گشتی و زاناکان بەتایبـەتی، بدەن.

٢/ هۆی دووهەمی کافربونی زۆربەی هەرە زۆری ئەوروپاییـەکان و زۆڵە مووسوڵمانەکانی لای ئێمەیش، گومڕایی زانیارییـە ، ئەو مرۆڤـەی کـە بۆی دانـراوە کـە بـرای مـەیمون نـەبێ ئامۆزایـەتی و ئـاژەڵێکی وەك هـەر ئـاژەڵێکی گـەورە بـووی نـاو ئەشکەوتەکانی شـانەدەر و نێندەرتاڵـە، پـێش چـەند سـەدەیەکی کـەم، زۆر کـەم، تەنانەت هۆی هەڵاتن و ئاوابونی خـۆری نـەدەزانی و وای ئـەزانی هێزێکـی ئـەودیوی سروشـت ئەمسـەر و ئەوسـەری ڕۆژئـاوای پـێ ئـەکات، چـەند سـاڵێك دیاردەیـەکی سروشـتی بـە نیشـانەیەکی ئـەودیوی سرووشـت ئـەزانی و ئەسـتێرە زێڕینـە لـە ئـەوروپا نیشـانەی خـوا بـوو بـۆ یادخسـتنەوەی پـەیمان، لـە کوردسـتانی خۆشمـان ـ پرچـی ئایشـە و فاتمـە ـ بوو، زاناکانی ئـەوروپا بونـە کـەوی نێـو قەفـەزی پیـاوانی ئـایینی و دەفیـان دەنگـی نەئـەدا و پیاوی ئایینیش هەر تاوە ناتـاوە یـەك چەقۆیان لـێ ئەسوین، بە سـووتاندن و بەنـدکردن و هەڵواسـین و دوورخسـتنەوە و سـزا و

چەرمەسەری، ئەیان ویست قڕوقەپ بە زاناكان بكەن، بە هیچ شێوەیەك باسی چۆنیەتی ڕووداوەكانی سروشت نەكەن، چونكە لەگـەڵ ئینجیلـە دەستهەڵبەسـتەكەی ئـەوان و تەوراتـە كارتۆنییەكەی سەهیۆنیدا ئەچن بە گژ یەكدا، بۆ ماوەیەكی زۆر دەنگی زوڵاڵی زانیاری لە ئەوروپا خەفە كرابوو، خۆ دیارە كە هەموو پاڵەپەستۆیەك تەقینەوەیەك دروست ئەكات، بەتایبەتی پاڵەپەستۆ لەسەر زانیاری و ژیری ئادەمیزادی ڕۆشنبیر، بۆیە گـەورەترین تەقینـەوە ڕووی دا دژی ئـاین، تـەنیا بـە ئـاینی مەسیحی و یەهودییەوە نەوەستا، بەڵكو بە ڕاستی هەموو ئاینێك پێشێل كراو هەموو بەرنامەیەكی خوایی بۆ مرۆڤ وەكو ئینجیل و تەوراتەكەی ئەوان سەیر كرا، هەندێ بەناو زانا كە بۆ ڕۆژێكی وا ئەگەڕان، بە فرسەتیان زانی و هەستان چەند بیروباوەڕێكیان، چەند قینێكی پیشخواردوو كە پێوەی ئاووس بوو بون، مۆری زانیارییـان لـێ داو بـە نـاوی شـەڕی زانیـاری و ئاینـەوە بڵاویـان كردەوە ئەمانە وایان ڕاگەیانـد بـە خـەڵكی كـە ئاین بریتییـە لـە شتێكی بێ ناوك، ئاین بریتی بوو لە هەوڵدانی مرۆڤی كۆن بۆ زانینی نهێنییەكانی بونەوەر، بەڵام بەشێوەیەكی هەڵەو دوور لە ڕاستی و هـەموو بیردۆزە میثالییەكانی ئاین، زانیاری بە درۆی خستنەوە و ئیتر پێویستمان بە هیچ بیردۆزێكی میثالی نییە...

ئەم شانۆگەرییە تازەی کوفر و پاڵەوانانی دوورە کە ئەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە باسی بکەین، کە سەرنجی زۆر لە لاوانی ئێمە و زۆربەی لاوانی ئەورووپای ڕاکێشاوە، بە شێوەیەك کە واقی وڕکردوون و هیچ دەنگێکی ڕاستی نابیستن و حۆڵی کردوون، شانۆگەرییەکە لە نووسینی زاناکانی سەهیۆنی جیهانییە، بەپێی دەقی (پرۆتۆکۆلی) دووهەمی سەهیۆنی، ئەڵێ:

"وا مەزانن وتەکانمان چەند قسەیەکی بۆشە، بە چاوی خۆتان ببینن کە سەرکەوتنی داروین و مارکس و نیچە (Nietche) ئێمە خۆمان پەروەردەمان کردوون.(٢٤)

هەروەها چۆنیەتی شانۆگەرییەکە و هەڵواسینی پڕوپاگەندە بۆ شانۆگەرییەکە و چەسپاندنی لە دڵی جەماوەراندا، وردترین نەخشە و دۆزەخیترین داوی بۆ تەنراوە و بلیمەتترین پاڵەوانیان بۆ هەڵبژاردووە، زۆر بە جوانی فێر کراون چۆن هەریەکەیان بە دەوری خۆی هەڵسێ و چۆن بە زمانی سەردەمی خۆی ئەدوێت، هەریەکەیان لە ڕوویەکەوە شانۆگەرییەکە تەواو ئەکەن، بۆ نموونە:

نیوتن ئەڵێ: پێویستمان بە هیچ خوایەك نییە ئەستێرەکان ڕابگرێت، هێزی کێشکار (جاذبیة) بۆمان ڕائەگرێ.(٢٥)

---

[٢٤] برتوکولات حکماء الصهیونیة، الطبعة الثانیة، پرۆتۆکۆلاتی دووەم ، ل١٣٢.

هیکسی(٢٦) ئەڵێ: کاتێ مرۆڤ دەسەڵاتی هێزی سروشتی نەبوو، هەڵسا ئاینی دروست کرد بۆ بەربەرەکانێی ئەو ترسە، ئەویش لە قۆناغێکی نەزانی و نەفامێتیدا.(٢٧)

لینین لـە مـانگی ئۆکتۆبـەری ١٩٢٠ لـە وتارێکـدا لـە رێکخـراوی لاوانـی کۆمۆنیسـتدا، وتـی: ئێمـە باوەڕمـان بـە بـونی خـوا نییە...ئێمە زۆر بە باشی ئەزانین کە پیاوانی (کەنیسە)، پیاوانی ئایینی و دەرەبەگـەکان، بـۆ ئـەوە بە نـاوی خـواوە ئـەدوێن تـاکو بمانچەوسێننەوە، بۆ پارێزگاری لە بەرژەوەندیی خۆیان. مارکس لای وایە ئاین چەکی دەستی دەوڵەمەنـدە بۆ گیـانی هـەژارەکان.

فرۆید لای وایە کە سرووش (وەحی) پێغەمبەران بریتییە بووە لە نەخۆشـی و نائاسـایی ئـادەمیزاد و بریتـی بـووە لـە هسـتریا و شێتی. داروین، ئەڵێ: پێویستی بونەوەر بە خوا وەکو ئامێرێکی میکانیکی پێویسـتی بـە هێزێکـی میتـافیزیکی ببێ، وایە. واتـە پێویستی پێی نییە.(٢٨)

بەکورتی لای ئەوان ئاین بریتییە لە چەکێکی پارە، هیچ مایەو متمانە ـ رصید ـ یێکی نەبێ لە بانکی زانیاری دا.

---

[٢٥] بەڵام جاذبیة چییە ؟ ئەبینرێت ؟ ماددەیە ؟ چۆن پەیدا بووە ؟

[٢٦] معرکة التقالید، محمد قطب، ص٦٢، الطبعة الثانیة.

[٢٧] الاسلام یتحدی، ص٢٩.

[٢٨] محاضرة، الاسلام والحضارة الغربیة، د. محمد قطب، ١٣٩٥ه.

## ڕواڵەتی دووەم/ گومڕایی زانیاریانە:

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم زانایانە هەندێکیان ڕێگای چوونە لای خوایان لێ تێك چووە و هەندێکیان تووشی گومڕایی زانیاری بون و هەندێکی تریان ئەگەرچی ئەوانە بە زانا دانانرێن، بەڵام ڕووی (بێ کەس) ڕەش بێت کە خەڵکی لینین و مارکس و ئەنجلز لە ڕیزی زانایاندا ئەژمێرن، ئەوانە ئەرکێکی تایبەتییان پێ سپێرردراوە و مۆری زانیاری (تەخلیت) یان لە خۆیان داوە، ئەگینا ڕاستی وتەکانیان وا نییە، چونکە:

أ. زانیاری چەندە پەلبهاوێژێ و نهێنییەکانی بونەوەر و مێژووی ژیان بدۆزێتەوە ناتوانێ لە نرخی ئاین ـ ئیسلام ـ کەم بکاتەوە، بەڵکو زیاتری ئەکات، چونکە زانیاری هەر ئەوەندەی بۆ دەرئەکەوێت کە بزانێ ئەو شتە وایە، ئیتر وا بە زانیاری نازانێ، لێرەدا ئاین ـ ئیسلام ـ دەورە گرنگەکەی دێت و ڕاڤەیەکی ڕاستیمان بۆ ئەکات، تەنیا ئەوەندە هەیە ڕواڵەتی پرسیارەکە لەگەڵ پێشکەوتنی زانیارییدا ئەگۆڕێت بۆ نموونە: ئەو هێلکەیەی ئەنرێتەوە بۆ جوجك هەڵهێنان، پاش ماوەی (٢١) ڕۆژ جووجەڵە دەردێت، جاران ئەیان وت خوا ڕێگای نیشان داوە و

دەرى هێنـاوە، بـەڵام ئەمڕۆكـە زانيـارى بـۆى دەرخسـتووين شاخێكى بچكۆلانە لە سەرووى دەنووكى جوچكەكەوە دەردێت (٢٩) ئەگەڕێت بۆ تـەنگترين شوێنى هێلكەكە بۆ ئـەوەى بيشكێنێ و بێتـە دەرەوە، پـاش مـاوەى چـەند ڕۆژێكـى كـەم كـە لـە هێلكـە جووقـا، وردە وردە شـاخەكەى نـامێنى و لائەچـێ، لـەم نموونـە بچـووكەدا، بـێ بڕواكـان ئـەڵێن وا زانيـارى بـۆى دەرخسـتين پێويستمان بە خوا نييە بۆ جوچك لە دەرهێنانيدا، ئەو شاخە كەفيلە بە دەرهێنانى لە هێلكەدا، بەڵام ئەگەر سەيرێكى قووڵترى باسەكە بكەين، جێدەستى خوامان زياتر بۆ دەرئەكەوێ، جاران كە ئەمانوت چۆن ئـەم جوچـكە دێتـە دەرەوە، ئـەمڕۆ ئـەڵێن ئـەو شاخە كێ دروستى كردووە لە كاتى پێويستدا ؟

كێ پاش تەواوبونى ئەركەكەى تواندييەوە؟

كێ تەنكترين شوێنى هێلكەكەى نيشان دا ؟(٣٠)

---

[٢٩] الاسلام يتحدى، ص٣١

[٣٠] الذي قدر فهدى. الأعلى ئايەتى ٤. لەگەڵ ڕێزم بۆ مامۆستاى نووسەر، ئەپرسم ئايا ئەو بۆشاييە كە لە سەرێكى هێلكەدا لە كاتى كولاندا بە ئاشكرا ديارە، چييە و كێ دروستى كرد و بۆچى؟ لەوەلامدا ئەڵێين بێ گومان ئەوەى گازى تێدايە و جوچكەكە هەناسەى پێ ئەدات هەتا ئەركاتەى دێتە سەر زەوى، بۆ ئەوەى نەمرێ. ئەم وردەكارى و تواناداريیەش تەنها لە لايەن خواى گەورەوە بەدى دەهێنرێت و لە تواناى هەموو بوونێ بەدەرە...

هەموو دەسەڵاتێکی زانیاری ئەوەیە بتوانێ و بزانێ چۆن ئەو شاخە دروست ئەبێت، بەڵام هەرگیز ناتوانێ بزانێ کێ نەخشەی جیۆلۆجی هێلکەکە ئەدات بە جوچکەکە، وەڵامی ئەم پرسیارانە ئەدرێتەوە دەستی ئاین و باوەڕ بە خوا.

ب. زانیاری سەروبەری ژیانی ئادەمیزاد نییە، چونکە زانیاری ئادەمیزاد لە ماددە تێپەڕ ناکات، مادەیش هەموو شتێك نییە، زۆر شت هەیە ماددە نییە و ئەبێتە هۆی گۆڕانی سەرەکی ڕواڵەتی ژیانی ئادەمیزاد، ڕاست ئەکەم کە ئەڵێم ماددە هەرگیز سەرچاوەی کامەرانی و دڵ ئارامی مرۆۆ نییە، بەڵکو باوەڕ بەودیوی ماددە و گیان و خوا، سەرچاوەی ژیانێکی پڕ لە بەختیارین بۆ مرۆۆ.

(سومرت صۆم) نووسەری جیهانی پایەبەرز، چەند ڕاستی وتووە کە ئەڵێ: ئەمڕۆ ئەورووپا پشتی کردووەتە خوا ڕاستەکەی و خوایەکی تازەی بۆ خۆی دروست کردووە کە زانیارییە، بەڵام زانیاری شتێکی بێ بارە، ئەوی ئەمڕۆ هەوڵی چەسپاندنی ڕاستی ئەدات سبەینێ هەڵی ئەوەشێنێتەوە، ئەوەی دوێنێ یەخەی حاشای لێ هەڵ ئەکات، ئەمڕۆ باوەشی بۆ ئەگرێتەوە و هەوڵی چەسپاندنی ئەدات، لەبەر ئەم بێ باری زانیارییە سەیر ئەکەین ئەوانەی کە زانیاری بە خوا سەیر ئەکەین، شوێنی

ڕاستی خۆی نادەنێ، هەموو ژیانیان لە دڵەتەپێ و ناوبانگ و خۆنەگریدایـە و بـێ ئـارامی بـاڵی ڕەشـی بەسـەر ژیانیانـدا کێشاوە، [31]

چونکە ئەگەر گومڕایی زانیاری سەرمان لێ نەشێوێنێ و فومان تێ نەکات و بە چاوێکی ژیرییەوە سەیری چوارچێوەی زانیاری بکەین، سەیر ئەکەین زۆر شتی ژیانمان هەیە کە زانیاری ناتوانێ ڕاڤەی بکات، تەنانەت هەر لە بواری زانیارییدا شتی وا هەیە کە زانیاری ڕاڤەی ناکات، جۆرە نەشتەرگەری (عملية جراحية)یەکی کۆن هەیە کە گەلێ سەرکەوتوو ترە لە عەمەلیاتی پزیشکی تازە و زانیـاری نازانـێ چۆن ڕووداوەکە ڕاڤە بکات، ئەویش بریتییە لەوەی بۆ دەرهێنـانی هـەر لویـەك یـا پارچە گۆشتێکی زیـادە لـە لاشـەی ئـادەمیزاددا، یـان هـەر جـۆرە کردارێکـی تـری پزیشـکی، چەند شوێنێکی تایبەتی هەیە لە لاشەی ئادەمیزاددا کاتێ چەند دەرزییـەکی لـێ ئـەدەن، ئـەو نەخۆشـە چـۆن ورگـی لـەت بکرێـت، سکی هەڵبدڕێت، یان هەموو لاشەی توێ توێ بکرێت، هەست بە هیچ جۆرە ئازارێك ناکات، کە دەڵێم دەرزی، مەبەستم لە شرینقە نییە، بەڵکو مەبەستم لە دەرزی خـەیاتی، دەرزی درووما ن و بێ

---

[31] شبهات حول الاسلام، د. محمد قطب، ص١٢. ١٣.

ئـهوهی هـیچ جـۆره دهرمـانێکی لهگهڵـدا بـهکاربێت، ئـهم جـۆره عهمهلیاتانه له چیندا باون و تا ئێستا بهکاردێن.[32]

زانیاری ههر ئهوهنده ئهزانێت کاتێك ئهو دهرزییانه چهقێنران بهو شوێنه تایبهتییانهدا، مرۆڤهکه بێ ئهوهی بهنج بێ یان بێهۆش بێت، ههست به ئازاری ورگ ههڵدڕینهکه ناکات و له قسهکردنی خۆیشی ناکهوێت.... هۆی چییه تا ئێستا نهزانراوه؟

٣/ هـۆی سێههمی ئـهورووپایی و مووسـوڵمانهکانی لای ئێمـه و بگره ههندێ له زاناکانیش، ئهگهڕێتهوه بۆ چۆنێتی گهڕاندن به دوای خوادا .[33]

ئهیانـهوێ خـوا وهك مـادده یـان وهك وزه بیدۆزنـهوه و بچێته ژێـر میکرۆسـکۆبهکهیانهوه، چـونکه لای ئـهوان ههرچـی بـه میکرۆسکۆب و تلسکۆب نهبینرێت، ناتوانن بڵێن ههیه، کهچی به هـهزاران شـت دهوریـان داوین و نـه ئهبینرێن و نـه ئهیانناسین، وهك:

أ. تیشکهکانی × سینی . ههر ههموو شهپۆلهکانی بێتهل.

ب . ئهگهر پرسیار بکهی له ههر مامۆستایهك بڵێی کارهبا چییه؟ ئهڵێ کارهبا بریتییه لـه لێشاوێکی ئهلیکترۆنی، بڵـێ مامۆستا

---

[32] احادیث في آسیا، محمد حسنین هیکل، ٤٩ (٧١) .

[33] الله في الفلسفة الحدیث، جیمس کولبر، گۆڕینی فوئاد کامل .

ئەلیکترۆنـــەکان خۆیـــان کارەباکـــەن ؟ ئـــەڵێ نـــەخێر، بـــەڵکو ئەلیکترۆنەکان هەڵگری کارەباکەن .

بڵێ ئەی کارەباکە خۆی چییە؟ ئەبێ بڵێ چی ئەڵێی، تا ئێستا نەزانراوە تەوژم و وزەی کارەبا چۆنە و چییە؟

ج. هەرچی نەخشـەیەکی سوڕاندنی ئـەلیکترۆن دانـراوە هـەمووی خەملاَندنە و هیچ زانایەك نەیدیوە.

د . ژیری و هێزی کێشکار . جاذبیة . گیان و دەروون (نفس)، ئـێش و ئـازار و هەسـتی برسـێتی و پەسـتی ژیـان و هـەزاران داخوازی لاشە و هـەزاران شتی تر، کە چواردەوریان گرتووین، بەڵکو هەریەکەیان پارچەیەکن لە ژیانمان، کەچی نەماندیون و نایان ناسین، ئیتر ڕاستە بڵێین نین ؟ یان بە بۆچوونێکی ماددیانە بۆ هەندێکیان بچین ؟

دیـــارە نـــەخێر، ئەگـــەر بمانـــەوێ ســـەروبەری ژیانمـــان و دروستکەرەکەمان (خواکەمان) بە گەز و کیلۆی ماددیانە بکێشین و بی پێوین، دیارە دەرناچین.(٣٤)

ئـافرەتێکی گـەڕۆکی ئـەوروپی لەگـەڵ مێردەکـەیا ئەچـنە لای مەلایەك لە یەمەن و ئافرەتەکە بە مەلاکە ئەڵێ: مامۆستا پێم بڵێ

[٣٤] تأملات میتافیزیقیة في الفلسفة الأولى ، رایفة دیکارت، ترجمة د. کمال الحاج. ل٢٥.

ئـەو خوایـەی ئێـوە ئەیپەرسـتن چـەند درێـژە و چـەند پانـە و کێشانەی چەندە، تاکو منیش باوەڕی پـێ بکـەم وەکو ئێوە ببمـە مووسـوڵمان. مامۆسـتاکە ئەفـەرموێ: منـیش پرسـیارێکت لـێ ئەکەم ئەگەر تۆ وەڵامی پرسیارەکەی منت دایەوە منیش وەڵامـی پرسـیارەکەت ئەدەمـەوە، ئافرەتەکـە ئـەڵێ فـەرموو، مامۆسـتاکە ئەڵێ: ئایا تۆ مێردەکەی خۆتت خۆش ئەوێ ؟

ئافرەتەکە دەڵێ بەڵێ زۆرم خۆش دەوێ .

مامۆسـتا: توخـوا پـێم نـاڵێی چـەند کیلۆمـەتر یـان چـەند ئـەم مێردەت خۆش ئەوێ؟

ئافرەتەکە: مامۆستا خۆشەویستی چۆن بە کیلۆمەتر یان بە کیلۆگرام ئەپێورێت.

مامۆستاکە: ئەگەر خۆشەویستی کە دروستکراوە، گەردن بۆ پێوەر و کێشانەی ئێمەی ئادەمیزاد کەچ نەکات...

ئـەی خوایـەك کـە دروسـتکەری ئێمـە و ژیـان و بیروهـۆش و پێوەرەکانمانە چۆن گەردنکەچ دەبێ بۆ پێوەر و گەز و تەرازووی ئێمـە، کـە هـەموو گـەز و تەرازوویەکی ئێمـە ڕێژەییـە و هـەریگز دۆخێکی چەسپاو وەرناگرێ.

٤/ هۆیـەکی تـر لـە بـێ بڕواییـەکان بریتییـە لـە سـەیرکردنی پارچەیەکی ژیان و بونەوەر و پچڕاندنی لە زنجیرە ڕووداوەکان و

فەرماندان بە سەریدا، کاتێ سەیری ڕووداوێکی ئاڵۆز لە بونەوەر ئەکەن .

وەك بوومەلەرزەیـەك، یـان لافاوێـك، یـان دەردێکی کوشـندە، یـان جەنگێکی جیهانی کە درەوی چەند ملیۆنێك ئادەمیزاد دەکەن و ڕەوڕەوەی پێشـکەوتنی ئـادەمیزاد زۆر دوائەخـەن، یـان کاتـێ سەیر ئەکەن گەلێکی هەژار و بەشخوراو و ژێرچەپۆکە بە هەزاران دەردیسەری و ئێش و ئازار و ئەشکەنجە، بە خۆڕایی و بێ تاوان بەسەردا دێت و بە هەزاران ڕۆڵـەی لاوی لـێ هەڵئەواسرێ و دڵـی هەزاران دایك هەڵئەقرچێ و شەرەف و ئابڕووی ئەو گەلە هـەژارە ئەخرێتە ژێر پێ، ئەڵێن ئەگەر ڕاست بێ و خوایەك هەبێ و وەکو ئێـوەی مووسـوڵمانان و خـاوەن بـاوەڕان ئـەڵێن... بەخشـندە و میهرەبان بێ و دروستکەری بونەوەر و یاسا وردەکەی سروشت بێ، چۆن ئەبێ لەم هەموو ئاشووبە و ستەمکارییەدا بە بێدەنگ دانیشتبێ و ورتەی لێوە نەیەت....لێکۆڵینـەوەی خێر و شەڕ لە کارەکانی گەردون و ژیاندا، جێگای شەڕە وتـەی فەیلەسوفە زۆر کۆنەکانە، بەڵام وا بە چەند خاڵێك ئێمـەیش ئەم باسە ئەخەینە ژێر توێژینەوە.

أ. کاتێـك باوکـێ منداڵەکـەی بـە دەسـتی خـۆی ئەباتـە لای پزیشـکێکی برینسـاز بـۆ ئـەوەی نەشـتەرگەریی بکـات، دیـارە

منداڵەکە ئەزریکێنێ و هاوار دەکات لە باوکی، باوکی بە دڵ ڕەق ئەداتـە قەڵـەم، چونکە تـەنیا سـەیری ئـەو سـات و ڕۆژە ئـەکات، بەڵام کاتێ گەورە بوو و ژیـری فراوان بوو، ئەوکاتە ئـەزانێ ئـەو نەشتەرگەرییە ئەوپەڕی دڵسۆزی و بەزەیی باوکانە بوو.(٣٥)

ئێمـەش ژیـری و زانیارییمـان هـەموو فەلسـەفەی بونـەوەر و نەخشـەی خـوایی نازانێـت، چونکە وا ئـەزانین بـە مـردن هـەموو شـتێك کۆتـایی دێـت، بـەڵام ئەگـەر بڕوامـان بـە ڕۆژی پاداشـت ـ قیامەت ـ هەبێت، شەڕ لە بونەوەردا بەدی ناکەین، بەڵکو هەمووی خێر و فەرمانکاری خوایە.

ب ـ خێر و شـەڕ هـەروەك هـەردوو ڕووەکـەی پـارە، شـێر و خـەت، وایـە، جـەنگ لـە ڕوویـەکی تـرەوە خێـرە، ڕاسـتە لـە جەنگـدا ماڵوێرانی و خوێن و خۆڵ تێکەڵاوبون و بۆنی بـارووتی لێـدێ، بەڵام لەلایەکی ترەوە بووە هۆی یەککگرتنی ئادەمیزاد لـە ترسـی جەنگ ئادەمیزادان یەکیان گرت لە خێزانـەوە بۆ خزمایـەتی و لـە یەککگرتنی خزمایەتییەوە بۆ عەشایەری و هۆز و کۆز دروستبون، لەوێوە بۆ یەککگرتنی نەتەوایەتی و هاوزمـانی و هاونیشـتمانی و هاوئـاینی و هـەتا لـە ئەنجامـدا نوێنـەری هـەموو ئـادەمیزادانی سەرزەوی لەسـەر سفرەی نەتـەوە یـەککگرتووەکان کۆبونـەوە، ئـەم

---

[٣٥] سەیری کتێبی (الله) د. مصطفی محمود عقاد بکە، ص١١٠.

یەکگرتنانە هەمووی لە ترسی جەنگ دروست بووە. هەر لە کاتی جەنگـدا و بلێسـەی ئـاگری مـاڵ سـووتاواندا بـوو، (پەنسـلین) دۆزرایەوە و گواستنەوەی خوێن لە ئادەمیزادێکەوە بۆ یـەکێکی تری بریندار دۆزرایەوە، ئایا بەهۆی جەنگەوە نەبوو وزەی ئـەتۆم دۆزرایـەوە و هـەر لـە کـاتی جەنگدا بـوو کـە کەشـتی ژێـر ئـاو - غواصـە - و بـاروت و تەنانـەت ڕادیـۆ دۆزرایـەوە. ئێمـە نـاڵێین جـەنگ سـوودی هەیـە، بـەڵام ئـەڵێین شـەڕی ڕووت لـە بونـەوەردا نییە و هـەموو شتێ لـە بونەوەردا ڕێژەییـە، ئـەوەی بـە نیسـبەت کۆمەڵێکەوە بە شەڕ دادەنرێت، بەنیسبەت کۆمـەڵی دووهەمـەوە خێر و فەڕ و خۆشییە، جەنگی حوزەیرانی ١٩٦٧ شـەڕ بوو بۆ عەرەب و خێر بوو بۆ جولەکە، جەنگی ئۆکتۆبـەری ١٩٧٣ شـەڕ بوو بۆ جولەکە و خێربوو بۆ عەرەب.

ج. کـورد ئـەڵێ ( تـا نەچـێژی سـەرمای زسـتان نـابینی بـاخ و بێسـتان )، زۆر ڕاسـتە، ئەگـەر ئـێش و ئـازار و چەرمەسـەری لـە ژیان بسـڕێتەوە، ئەوکاتە ژیـان هـیچ تـامێکی نامێنێ و بێ مانـا ئەمێنێتـەوە، ئەگـەر سـتەمکاری نـەبێ دادپـەروەری چ تـامێکی هەیە؟

ئەگـەر ئەشـکەنجە و ئـازار و گـوڵێتی نـەبێ، تەندروسـتی و ئازادی و خۆشگوزەرانی چ لەزەتێکی تێدا ئـەمێنێ، هەریەکـەیان

له بەرانبەر دژەکـەی و خێـر لەبەرابـەربونی شـەڕەوە نرخـی هەیـە، ڕەحمەت له پێشەوا غەزالی که ئەفەرموێ: بونی شەڕ له بونەوەردا وەکو لاریـی کـەوانی تیروکـەوان وایـە... ئەگـەر کەوانەکە ڕاست بکرێتـەوە کارەکـەی خـۆی ناکـات، هـەروەها ئـەو پەڵـه شـەڕانە هەوێنی جوانی بونەوەرن ).[٣٦]

د- ئەوانـەی هـەوڵی چەسـپاندنی پشـێوی بۆ ژیـان و ئاڵۆزی بـۆ بونەوەر ئەدەن، هەر هەموو ئەو بەڵگانەی بەڵگـەن بۆ بـونی ڕۆژی پاداشــت و ڕۆژی قیامــەت، چـونکه زۆر ڕاســته کـه شــەڕ لــەم بونەوەره پڕ له یاسایەدا شتێکی ناڕاسته و لای هەموو مرۆڤێکی ژیـر کـردەوەی چاکه و کـردەوەی بێفـەڕ وەك یـەك نـین، چ جـای ژیرییەك که دروستکەر و بەدیهێنـەری بونـەوەره. خۆ زۆر ڕاسته که لەم جیهانی ژیانەماندا هەزاران ماف پێشێل ئەکرێ و بۆ هـەتا هـەتایی گـۆڕ ئـەکرێت و هــەزاران سـتەمکار لــەناو زەلکـاوی ستەمکارییدایه به ئارەزووی خۆی مەله ئەکات هەتا ئـەمرێ، که مردیش بەوپەڕی ڕێزەوه ئەنێژرێت، ئەمه له لایەکەوه، له لایـەکی تــرەوه هــەزاران چــاکەخواز و خێرخــواز بــه ئــاخ و ئۆفــەوه ســەرئەنێتەوه، لێــرەدا ئەگــەر ڕۆژی پاداشــت بــه مەقەســتی ماددییەت بقرتێنین لـه ژیـان و سـەیری تـەنیا ئـەم چـەند ڕۆژەی

---

[٣٦] حوار مع صديق الملحد، د. مصطفى محمود، ص٢٢.

ژیـان بکـەین، ڕاسـتە گـەر بڵـێین ئـەم هـەموو شـەڕە چییە لـە بونەوەردا ؟

ماددییەکان ئەڵێن مێژوو دادگای ڕاستە بۆ جیاکردنەوەی هـەموو خێـر و شـەڕێك لـە ژیـانی ئـادەمیزاددا، ئەگـەر چـاکەخواز و پیاوباش بوو وا بـە دێڕی زێڕین نـاوی ئەنووسـرێ، خۆ ئەگـەر پیـاو خـراپ بـوو، شـەڕانی بـوو، ئـەوا ئـەیکات بـە ژێـر لێزمـەی تفبارانەوە.

ئێمەش ئـەڵێین: دادگـای مێژوو بـەس نییـە بۆ پاداشتی چاکە و خراپە ، چونکە:

یەکەم: مێژوو تەنیا کردەوەی پیاوە گەورە ناودارەکان ئەداتە بەر نەشتەری شیکردنەوە و هەڵیان ئەسەنگێنێ ئـەی کـردەوەی خێـر و شـەڕی ئەندامـەکانی تـری گەلـەکان کـێ هـەڵی سـەنگێنێ و پاداشت یان سزایان ئەداتەوە؟

دووەم: ئـەو سـتەمکارەی بـە سـتەمکاری ئـەژی و بـە سـتەمکاری ئەمرێ و بە ڕێزیشەوە ئەنێژرێت پاش مردنی خۆی مێژوو ئەگەر هـەزاران نازنـاوی چـاکە و ستایشـی پـێ ببەخشـێ، یـان هـەزاران جنێوی بـداتێ و ناوونـاتۆرەی ناشـیرینی دوابخـات، چ نرخێکـی هەیە ؟

(ستالین) کە ئەو هەموو ستەمکاری و دیکتاتۆرییەی بەرامبەر گەلی ڕوسی هەژار و تەنانەت ئەندامە هەرە بەرزەکانی پارتەکەی خۆیشی کرد، کەچی پاش مردنی لە گۆڕ دەرهێنراو بە مردوویی مەحکەمە کرا و لاشە بێ گیانەکەی سووتێنرا، ئەو مەحکەمە و سووتاندنەی چ نرخێکی هەیە، پاش مردنی ستالین . چ. هەستێك ئەکات بە ستایش یان بە جنێو و سووتاندن ؟

سێهەم: ئەوانەی کە لاپەڕەکانی مێژوو پڕ ئەکەنەوە و خەڵکی هەڵئەسەنگێنن، مرۆڤێکی ئاسایین و بە هەزاران پاڵەپەستۆی ئارەزووکاری (خۆشەویستی و ڕق) پاڵ بە نووکی پێنووسەکەیانەوە ئەنێ، هەزاران ڕاستی پێشێل ئەکەن، چونکە ئەوانە بەلایانەوە ڕاست نییە، کەواتە مێژوو هیچ چاکە و خراپە و خێر و شەڕێك پاداشت ناداتەوە، تەنیا ڕۆژێ پاداشت و ڕۆژی دادگای خوایی ڕەش و سپی دەرئەکەوێ.

هـ. بۆ ئەوەی لە مانای بونی شەڕ لە بونەوەردا تێبگەین، نموونەیەکی بچووك ئەهێنینەوە:

ئەگەر شانۆگەرییەکی (پۆلیس)مان بینی و لە شانۆگەرییەکەدا سەیرمان کرد پیاوێکی تاوانبار سامانی هەژارانی داگیر کردووە، بە بێ تاوان خەڵکی ئەکوشت و شەرەفی ئەندامەکانی کۆمەڵی بریندار ئەکرد، ئا لەم کاتەدا پێش ئەوەی بگەینە ئەنجامی پیاوە

تاوانبارەکـە، پـەردە دادرایـەوە، ئا لـەم کاتـەدا سـێ ڕاڤـە بـۆ ئـەم شانۆگەرییە ئەبینین:

١. ئـەم شـانۆگەرییە پـووچ و بـێ مەبەسـت بـوو، تـەنیا بـۆ کـات بەفیڕۆدان پێشکەش کراو هیچی تر.

٢. پاشـان، شـانۆگەرییەکی زیانبەخشـە، خـەڵکی هـان ئـەدا بـۆ تاوانکاری.

٣. شانۆگەرییەکی ناتـەواوە، بەشێکی یـان چەند بەشێکی تـری ماوە و جارێ پێشکەش نەکراوە. بونی شەڕ لە بونەوەردا وەك ئەم شانۆگەرییە وایە.

١. زاناکـانی ڕۆژئـاوا (کُفـر) لایـان وایـە ئـەم ژیانـەی ئێسـتا سـەروبەری ژیانـە و هـەموو شتێك بـە مردن کۆتـایی دێـت، هـەر تاوانبارێك لـەم ژیانـەدا تۆڵـەی لـێ نەسـەندرا وەکو بـەرزی بانـان بۆی دەردەچێ، هەر لەبەر ئەوە ئەبینین کۆمەڵگای ماددییەکان بە گشتی و ئەوروپا بەتایبەتی، لەوپـەڕی بـێ ئارامی و سرەوتن و دڵەتەپێیدا دەژین و بە بچووکترین کێشـەی ژیان هەڵئەچن، ئێمە لە خۆڕایی ئەمە نـاڵێین، بەڵکو خۆیـان لـە سـەرژمێرییەکانیاندا ئەڵێن.

شێتی لە ئەوروپا بە گشتی و لە ئەمریکا بەتایبەتی، بووەتە نەخۆشییەکی درم و قڕان [٣٧]

چەندە هەوڵ ئەدەن نەخۆشییە دەروونییەکان (المرض النفسي) و شێتەکانیان لەبەرچاوی خەڵکی بشارنەوە و نەخۆشخانە و شێتخانەکانیان دوور لە شار و لە بێشەلاّندا دروستکەن، بەلاّم ئەوەندە دیاردەی دڵەتەپە و بێ ئارامی خۆی کێشاوە بەسەریاندا، بۆیان ناشارێتەوە، [٣٨]

جارێ نەخۆشیی دەروونی بەشێوەیەك زاڵ بووە بەسەر دەروونی کۆمەڵگای ئەوروپیدا، بە دەگمەن لاوی کوڕ و کچی ئەوروپی هەبێ کە هەر تاوە ناتاوێ سەری دکتۆرێکی دەروونی نەدات، هەزاران تابلۆی دڵەتەپێی خۆی و نائارامیی دەروونی خۆی باس ئەکات. [٣٩]

---

[٣٧] الاسلام والحضارة الغربية، د. محمد قطب .

[٣٨] ئەوەتە رۆجیە گارودی لە کتێبی (مشروع الامل) لاپەڕە (٥) چاپی یەکەم، ١٩٧٧، دار الآداب، ئەڵێ: قورسایی دڵەتەپە و تەنگەلاّنی ژیان بەشێوەیەك سوارمان بووە کە لە هەموو مێژووی دوور و درێژی ئادەمیزاددا رووی نەداوە، ئەویش خەمی مانەوەی گۆی زەوی و مانەوەی دانیشتوانی گۆی زەوییە.

[٣٩] با ئەوەش بزانین کە زۆربەی زۆری . ئەگەر نەڵێین هەموو . پزیشکە سایکۆلۆژییەکانی ئەوروپا و ئەمریکا، جولەکەن و قوتابیی قوتابخانەکانی (فرۆید و دۆرکایم)ن، دیارە بە ڕێکەوت نییە، بەڵکو نەخشەیەکی سەهیۆنی جیهانی شوێنەکانی بۆ دیاری کردوون.

ئەگـەر سـەری لای پزیشـکێکی سـایکۆلۆژی لـە ئـەوروپا بـدەیت، سـەیر ئەکـەیت مشـتـەریی ڕۆژانـە و هـەفتانـە و مانگانـەی هـەیـە، هەریەکەشـیان خشـتـەیەکی تایبـەتییان بـۆ دانـراوە، بۆچـی بـەو شێوە پڕ لە مەترسییە ئەڕۆنە لای پزیشکە دەروونییەکان؟

ئایا لەبەرئەوەیە کە ساغن یان لەبەرئەوەیـە کـە نەخۆشـن، دیـارە لەبەرئەوەیـــە کـــە دەروونیـــان و گیانیـــان نەخۆشـــە نەخۆشییەکەیشـیان تـەنها نـەبونی بـاوەڕە بـە ڕۆژی دوایـی، خەفەتی لەدەست دەرچوونی تۆڵەیە تووشی نەخۆشییان ئەکات.

بەڵام مرۆڤی موسڵمان لێی ڕوونە بچووکترین کـردەوە چاکە بێت یـان خراپـە، تۆمـارە و ڕۆژی لێپرسـینەوەی هەیـە، لەبەرئـەوە هـەموو بونـەوەر بـە خێـر ئـەزانێت و شـەڕی تێـدا بـەدی ناکـات، شـانۆگەریی ژیـان بـە شـانۆگەرییەکی پـووچ و بـێ مەبەسـت دانانێت.[40]

٢. هەندێ لە فەیلەسوفەکانی مادییـەت و ئـەوروپی بـە گشـتی و وجودییـەکان بەتایبـەتی لـە سـەرووی هەموویانـەوە (سـارتەر)، لایان وایە ژیان زۆر قێزەونە و ڕشانەوە و دڵتێکچوون نـەبێ هیچ

---

[40] گەورەیی هەر بۆ ئەو خوایەیە کە ئەفەرموێت: ( وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ) (الأنبياء : ١٦ )

مانایەکی تر نابەخشێت(٤١) ، مرۆڤ چاکەخواز بێت یان شەڕانی هیچ جیاوازییەکی نییە، چونکە کە داسی مردن دروێنەی ملی کردن، ئەنجامەکەیان گەڕانەوەیانە بۆ ژێر گڵی هەتا هەتایی. کاتێ مرۆڤ خۆی لە خوا پچڕاند و بە تەنیا و بێ چرای باوەڕ لە سارای توانا و تونی تاریك و پڕ لە مەترسی ژیاندا بە کوێر و وێڵ بووی ژیا، زۆر ڕاستە کە ئەوە هەستی بێت بەرامبەر ژیان و دڵی تێك بچێت کە باسی ژیان کرا. بەڵام لای مرۆڤی مووسوڵمان کە دەستی بە دەستی خوا و بەدیهێنەری بونەوەرەوە دەبێت و لەبەر تیشکی باوەڕدا و لەسەر نەخشەی خوا هەنگاو هەڵئەنێ، هەرگیز ئەم ژیانە بە (عبث) نازانێ، مووسوڵمان کە گوێی لە خواکەیەتی ئەفەرموێ:

{ أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ } (القلم: ٣٥، ٣٦).

دیارە خوا ئەو مووسوڵمانانەی لە ترسی خوا ناوێرن ئازاری تاقە مێرووڵەیەك بدەن، ئەگەر شایەنی ئازار نەبێت، دیارە لەگەڵ تاوانبارێك کە دەستی بە خوێنی هەژاران گرتۆتە خەنە و سمێڵی بە ماڵ خواردنی ئەم چەور کردووە، هەرگیز وەك یەك سەیریان ناکات. کاتێ کە مردن هەردووکیان وەکو یەك ئەمرن، مانای

[41] سەیری کتێبی ( الوجودیة والغثیان ) محمد جواد بکە.

یەکسانییان نییە، بەڵکو مانای نادرنیانە بۆ بەردەم دادگا، دادگای خوایی.

٣. ڕاڤەی سێهەمی شانۆگەرییەکە، ژیان ڕاسترین ڕاڤەیە و بەشێکی گەورە، بەڵکو بەشە هەرە گەورەکەی شانۆگەریی ژیان لە پاش مردن دەست پێ ئەکات و مافخوراوەکان دەمی تاسە ئەخەنە ناو دەمی مافەکانیانەوە و پێیان شاد ئەبنەوە، ستەمکارەکانیش لە دۆزەخی کردەوەکانیاندا هەڵئەقرچێنێ.[٤٢]

٥/ هۆیەکی تر لە هۆیەکانی کافربونی ئەوروپاییەکان و تەنانەت هۆی کوشندەی کافربونی رۆڵەکانی ئیسلام و دزینیان بۆ کارگوزاری کردنی (کُفر)، نووستنی مامۆستاکانی ئاینی بوو.

کە زانای ڕاستەقینە زۆر زۆر کەم بووەوە و ژمارەیەکی زۆر چەتە و نەخوێندەوار خۆیان سەپاند بەسەر ئیسلامدا و نەک نازانن چۆن باسی ئیسلام بۆ خەڵکی بکەن، بەڵکو وەکو فارسەکە ئەڵێ:

( کۆلکە پزیشك گیانت دەرئەکات   کۆلکە مەلا دینت دەرئەکات )

بەهۆی ناموسڵمانی خۆیانەوە، ئەگەر تامی ئیسلام نەختێك چووبێتە بن ددانی لاوێك، ئەوان لە دەمیدا تاڵی ئەکەن و لە ئیسلام بێزاری ئەکەن، ئەوە بۆ ناو خۆمان، ئەوروپاش چۆن لە

---

[٤٢] سورة الواقعة ومنهجها في العقائد، محمود غريب، ل١٩، ٢٣، وە کتێبی: من هو سيد القدر، د. محمد سعيد رمضان البوطي.

ئیسـلام بگـات ؟! تـا ماوەیـەکی کـەم لەمـەوپێش کۆلکـە مـەلاکان ئەیانوت هەرکەس زمانی کافرێتی بخوێنێ، کافره[٤٣] کـە ئەمانــە زمــانی بێگانــە نــەزانن ئەوروپاییـەکان لـە زمانـە ئیسـلامییەکان، کوردی، عـەرەبی، فارسـی، تورکی، ئوردی، تـێ ئەگـەن و سەرچـاوەیان لـەبارەی ئیسـلامەوە بـە زمـانی خۆیـان دەسـت ئەکـەوێت، ئیتر چۆن ئیسـلامیان بۆ دەرکـەوێت؟ لێدانـە پاڵەوانییەکـەی پاڵـەوانی ئیسـلام و کـورد نـەژاد (سـەلاحەدینی ئـەیوبی) لــە خاچــەکان و فڕانــدنی (صــلیبیە) بەشــێوەیەکی دڵتـەزێن، بـووە هـۆی ڕق هەڵسـاندنی نووسـەرەکانی ئـەوروپا و بڵاوکردنـەوەی پڕوپاگەیەندەیـەکی زۆر بـۆ مووسـوڵمان و ئاینـە پیرۆزەکـەیان بەگشـتی و ناشـیرین کردنـی کەسایەتی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر بێت) لـە ئـەوروپا و بەتایبـەتی هـەتا بووە هۆی ماڵکاولییـان و نـەفرینکردنیان لـە ئیسـلام، ئۆف لـە دەسـت مەلا، ئەوەی پێی نەجزابێ بە پشکۆی هاوڕێیەتی مـەلادا، نازانـێ چەندە لارن، جارێ لە ئیسلامدا مەلا هەر نییە، تەنیا زانای ئاین (فقیـة) هەیـە، ئـەگینا مـەلا و مەلاچێتی هیـچ پەیوەندییـەکی نـە نزیك و نـە دووری بەسـەر ئیسـلامەوە نییـە، ئەگـەر ئـەو وڵاتانـەی

---

[٤٣] کەچی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هەڵمان ئەنێ بۆ فێربوونی زمانی بێگانە و ئەفەرموێ: "من تعلم لغة قوم امن من شرهم"، واتە: هەرکەسێ فێری زمانی هەر نەتەوەیەك ببێ، دڵنیا و بێوەی ئەبێ لە خراپەیان.

بەسەر ئیسلامەوە ئەژین، تەنیا ئەوانە ڕاستیان بکردایە لەگەڵ ئیسلام، هەموو هەڵسوکەوت و ژیان و خێزان و وتە و کردەوەیان سەربەسەری ئیسلام دەربچوایە، ئیسلام زۆر باسی ئەخەملاّ و ڕۆژێ نەئەگەیشتن بەم ڕۆژە.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) چەند جوانی فەرمووە کە ئەفەرموێ:

(خوا زانیاری لە خەڵکی بە لێسەندنەوە لێیان ناسەنێتەوە، بەڵام بە نەمانی زانای راستەقینە لێیان ئەسەنێتەوە، زانای ڕاستەقینەیان تێدا نامێنێ، خەڵکی چەند سەدێکی خاڵی لە زانیاری ئەکەن، ئەوانیش فتوا ئەدەن بێ ئەوەی بیزانن، هەم خەڵکی سەرلێشێواو ئەکەن و هەم خۆشیان زیاتر سەریان لێ ئەشێوێ ).[٤٤]

ببورن کە ئەوەندە بەبێ ئەدەبی باسی مەلا ئەکەم، دیارە ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموو مەلایەك خراپە، ئێمە ئەزانین کە کاتی خۆی مەلا چ دەورێکی بەرز و پیرۆزیان دی بۆ ئیسلام و چۆن بە کوێرەوەری و نەبونی و برسێتی و ئێش و ئازار کارگوزارییەکی بێ ئەندازەی ئیسلامیان کرد، ئەزانین ئەگەر ئەوان نەبونایە ئێمە هیچمان لە ئیسلام نەئەزانی، بەڵام کاتێ کوفر ویستی شاری

---

٤٤ رؤية علمية للإيمان، محمد رشيد عقراوي، ل٦٩.

باوەڕمان داگیر بکات یان کاول بکات، قەرەوڵگای پاسەوانەکانی شێوان و ئەندامەکانی قەرەوڵگای دزی بۆ خۆی و لەبێ خەبەران کەشکەك سلاوات بوو، دیارە قەرەوڵگای پاسەوانانی ئیسلام مەلا و مـاڵی مـەلا بـوو، بۆیـە ئەگـەر سـەیرێکی هـەر بنەماڵەیـەکی ئیسلامخوازی چەند ساڵ لەمەوبەر بکەین، ئیتر شێخ بێ یان مەلا، سەیر ئەکەین (کُفر) ڕۆڵەکانی دزیوە و هێلانەی لە ماڵیاندا کردۆتەوە!!

٦/ هۆیەکی تری کافربونی خەڵکی....

نەتوانین و بەجێ نەهێنانی ئەرکەکانی ئاینی ئیسلامە و ئەویش بـەهۆی نەخۆشـی دەروونـی یـان ژێـری، یـان بیرەوەرییانـەوە و شلکردنی جڵەویان بۆ ئارەزووکاری خۆیـان ، چونکە ژیـان خۆی ڕازاندۆتـەوە و ڕابواردنـە ناشـەرعییەکان بەشـێوەیەك ئارایشـت کراون و نەخشێنراون، ئەگەر باوەڕێکی پتەو نەبێ مرۆڤیان لێ ناگەڕێتەوە، دیارە ئیسلام سنوور دائەنێ بۆ هەموو شتێك لە ژیاندا، ئەوانەی کە ڕەشۆیان لەسەر داماڵاوە و کەوتوونەتە ناو لـەوەڕی جـوانی قەرسـیلەوە، نـاتوانن خۆیـان بگەڕێننـەوە، خـۆ ئەیشزانن هەرکە وتیان باشە موسڵمانین، ئەبێ لەبەر خوا زیان نەکەن، ئەوەیش بەوان ناکرێ، وا کافر ئەبن.

ئەم خاڵانـەی پێشـەوە کە پێشـکەشمان کـرد، چـەند هۆیـەکی سەرەکی کافربونی ئەورووپییەکان و هەندێ لـە مووسوڵمانەکانی لای خۆشمانـە، دیـارە هـۆی تـریش مـابون باسمـان نـەکردوون، وەکـو هاوڕێیـەتی خـراپ و خێزانـی خـراپ و هـۆی دەروونـی و ئابووری و ڕامیاری و .... هتد، ئەمانە زۆرجار هەریەکەیان ئەبنە هۆی دۆڕاندنی ئاین و نەمانی باوەڕ بە خوا.

## هەڵسەنگاندنی شارستانی ماددیەت :

جا ئێستا دێینە سەر هەڵسەنگاندنی شارستانیەتی ماددیـەت یـان ئـەوروپا، لـە ڕووی بیروبـاوەڕەوە و بـزانین ئایـا ئـەتوانین لـە ڕووی بیروباوەڕەوە هیچ لەو شارستانیە وەربگرین یان نا ؟

دیـارە بـە هـیچ شـێوەیەك ئێمـەی مووسـوڵمان بۆمـان نییـە لـە ڕووی بیروبـاوەڕەوە هـیچ لـە شارسـتانیەتی ماددیـەت وەربگرین، چونکە:

١. لە شارستانیەتی ماددیەتدا ئەم بونەوەرە بێ خوایە....

بەڕێکـەوت دروسـت بـووە، سرووشـت سەرپەرشـتی ئـەکات و یاســاکانی سرووشــت = القــوانين الطبيعيــة = ڕێــڕەوی هەڵسوکەوتی پارچەکانی بونەوەر ئەکات.

لـە کتـێبی ڕێکـەوت لـە تـەرازوی ژیرییـدا، سرووشـت لـە تـەرازووی ژیرییـدا، ئـەم بـیرە هەڵـە دوور لـە زانیارییـەمان بەرپەرچدایەوە و لێرەدا پێویسـت بـە باسـکردنیان ناکات. ئەو دوو ناميلكەيە زۆر زيادبوو، چونکە وتەکانيان ئەوەندە دوور لە گیـانی زانیارییـە و قسـەکانیان ئەوەنـدە منداڵانەیـە، ڕەوا نییـە مرۆڤ زۆر خۆی پێیانەوە خەریك بكات.

بـەڵام بیروبـاوەڕ لای ئێمـەی مووسـوڵمان بریتییـە لـەوەی ئـەم بونــەوەرە خوایــەك دروســتی کــردووە و ، لەخۆیــەوە نــەوەك

بونەوەر، بەڵکو هیچ شتێك دروست نابێ و ئێمەی مووسوڵمان خاوەنی بیروباوەڕی خۆمانین، ئەو بیروباوەڕەی کە وزەی ژیانمانە و مایەی سەربەرزیی هەردوو جیهانمانە.

٢. له شارستانیەتی ماددیەتدا وا ئەزانن ئاین تریاکی گەلانە و هەژاران ئەخەوێنێ .

بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکان و ستەمکاران خوێنیان بمژن، پیاوانی ئاینی هەموو کاتێ داری دەستی دەرەبەگ و بۆرجوازەکان بون، بۆ چەوساندنەوەی هەژارەکان، پێشەکی با بزانین ئەم دروشمە کێ وتی و لە چ کاتێکدا وتراوە و ئایا ئەم دروشمە ئەتوانرێ بکرێتە کاڵای باڵای ئیسلامیش؟

یەکەم کەس کە ئەم دروشمەی بەرامبەر بە ئاین هەڵواسی (کارل مارکس) بوو، پاش خۆیشی - هێلکە مارکسییەکان - کردیانە چاویلکەی خۆیان، لەو چاویلکەوە سەیری هەموو ئاینێك ئەکەن، دیارە ئەم دروشمە لە خۆیەوە نەوتراوە، دەرەبەگەکان و خاوەن سامانەکان چ لە ئەوروپای وڵاتی مارکس و لە ڕوسیای وڵاتی کۆمۆنیست، پیسترین هەڵوێستیان هەبووە بەرامبەر بە چینی چەوساوە، لە ڕوسیادا هەزاران کەس لە برسا ئەمردن و بە هەزارانی تر بە سیل و شێرپەنجە و دەیان نەخۆشی تر ئەمردن، هەژاری گەلەکەیش بوو بووە هۆی ئەوەی سەهۆڵ

بەنـــدانی وڵاتەکـــە هـــەموو ســـاڵێك ئەوەنـــدەی برســـێتی و نەخۆشـییەکان خـەڵکی لەناوبـەرێت، دیـارە ئـەم نەگبەتییانـە بـۆ چینی چەوساوە و هـەژار بوو، بەڵام چینی ئاغا و دەرەبەگەکان لەوپـــەڕی خۆشـــگوزەرانی و ڕابواردنـــا ئـــەژیان و ئـــەوەی بـــە ئەندێشەی مرۆڤدا بهاتایە لە ئامێری ڕابواردن و هۆی ژیانی پڕ لە کامەرانی، هەیان بوو.

خۆئەگـەر خوانەخواستە چـینی هـەژاران و ڕەش و ڕووتـانی گەلەکەیان هەر بە ئاستەم نوزەیان لـێ بهاتایە، بیان وتایە ئێمە هـەژارین، بەشـخوراوین، یان ئێمـەش ماف ژیانمان هەیە... هتـد یەکســـەر پیـــاوانی ئـــاینی وەکـــو قوزەڵقـــورت ئەڕۆیشـــتن بـــە گەروویاندا و ئەیان وت هەرکەسێ زلەیەکی دا لە لای ڕاستت لای چەپیشـتی تـێ بکـە بـا زلەیـەکیش لـەو بـدات. یـان ئـەیانوت هەرکەسـێ دەسـتی دایـە داوێنـی کراسـەکەت تـۆ یەکسـەر بـۆی داکەنە و بیدەرێ. بەوشێوەیە بەنجیان ئەکردن بۆ ئەوەی ئاغاکان جوانتر خوێنیان بمژن، خۆئەگەر هەر کەسێ بەم جۆرە قسانەش نەخەڵەتایـە و سـەری بـەرز بکردایەتـەوە و داوای مـاف ژیـانی بکردایە، ئەوا پیاوانی ئاینی ئەیانوت، ئادەی بیکوژن ئەمە لـە فـەرمانی گەورەکـەی دەرچووە و نمـەك حەرامـە و هەرکـەس لـە فـەرمانی خـاوەن زەوی دەربچـێت، وەکـو لـە فـەرمانی خـوا و

كەنيسە و پياوانى ئاينى دەرچوويێت وايە. بەڵكو كەنيسە خۆى گـەورەترين دەرەبـەگ بـوو پاپاكـان زۆر دەوڵەمەنـدتر بـون لـە ئاغاكان، بەوشێوەيە . فەتواى كوفر . دەرئەكرا بۆ هەركەسێ بيوتايە لەل، يان ئەسوتێنرا، يان ئەكوژرا و لە گۆڕەپانەكەيدا هەڵئەواسراو ئەكرايە دەرس بۆ هەركەسێ بيويستايە داواى ماف ژيان بكات، لێرەدا ئەتوانين بڵێين . ماركس . ناهەقى نەبووە وتوويـەتى ئـاين تريـاكى گەلانـە، هەرچـەند ئـاينى پـيرۆزى . مەسيحى . بەريى بوو لەم هەڵوێستە ناشيرينە، بەڵام چەتەكانى مەسيحى و پياوانى ئاينى كە ئينجيليان بەدەستەوەبوو، كليل بەدەستى كەنيسـە بون و بەدەم ڕاستى ئاينەكە ئەژمێران و بە ناوى ئاينەوە فەرمانيان دەرئەكرد.(٤٥)

ئەم هەڵوێستە ناشيرينەيان لە لاپەڕەى مێژوودا تۆمار كرد، ئەمە بوو بە كورتى هۆى وتنى . ئاين ترياكى گەلانە . جا ئێستا با بزانين ئەم وتەيە بەسەر ئيسلاميشدا تەتبيق ئەكرێ...

ئايا ئيسلاميش ترياك بوو بۆ گەلانى موسڵمان و بەنجى كردوون و پێى كۆت كردوون لە شۆڕشكردن بەرامبەر بە ستەمكارى؟ نەخێر هەرگيزاو هەرگيز ئاينى پيرۆزى ئيسلام ئەندامەكانى بەنج نـەكردووە، بـەڵكو ئـاينى پـيرۆزى ئيسـلام وزەى لـەخۆبوردن و

---

[45] شبهات حول الاسلام، محمد قطب، ص١٦٧.

فیداکاری له گیانی لاوەکاندا دروست کردووە... جاریێ ئیسلام بـه نیسـبـەت تـاك ـ فـرد ـ ەوە، هـەموو کاتـێ هـانی داوە لەسـەر کارکردن { وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ } (التوبه: ١٠٥)

له ئیسلامدا هەرگیز نابێ مووسوڵمان له حەقی خۆی بێدەنگ بێ و مل شۆڕ بکات بۆ ستەمکار، قورئـان ئەفەرموێ: { إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنْتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا } ( النساء : ٩٧ )

واتـە: ئەوانـەی فریشـتە گیانیـان ئەکێشـن و سـتەمیان لـە خۆیـان کـردووە بـەوەی ملکـەچ بـون بـۆ سـتەمکاری و دەسـتەمۆبون بـۆ زۆردار و تەمـــەنیان بـــە کـــۆت و ترســـنۆکی و ســـەلامەت بەسـەربردووە، فریشـتەکان لێیـان ئەپرسـن ئـەرێ ئێـوە لـە کـوێ بـون؟ ئـەوانیش ئـەڵێن بـەخوا ئێمـە چینی هـەژار بـووین و هـەر چەوسێنراو بووین لەسەر زەویدا.

ئـەی زەوی خـوا فـراوان نـەبوو بـۆ کـۆچ کـردن؟ لەلایـەکی تـرەوە هەوڵی گۆڕینی باری گەلەکەتان بدەن، ئەوانە پاشەڕۆژیان بۆ ناو دۆزەخە کە ناهەموارترین پاشەڕۆژە، بـەڵی وەکو خـوا ئەفـەرموێ

پاشەڕۆژیان بۆ ناو دۆزەخە، چونکە بێدەنگ بون لە ستەمکاری و هەوڵی بڕینی دەستی زۆرداریان نەداوە.[٤٦]

کەواتـە ئـاین بـە نیسـبـەت (فـرد) تاکـەوە ئاگـاداری و ڕاپـەڕین و چاودێری دەروون و ـ ضـمیر ـ خۆئامادەکردنـە بۆ لێپرسـینەوە لەلایـەن خـواوە، لـە هـەموو کـردەوە و چپەیەکی نـاو تـوێ تـوێی دڵــی، کــەی ئەمــە حــاڵی ســەرخۆش و بــەنگ کێشــە، بــەڵکو سەرخۆش و ترياك خۆری ڕاستەقینە بریتییە لەو مادییەی دان بە ئاین و ڕۆژی پاداشتدا نانێت، بۆ ئەوەی ڕا بکات و هەڵبێت لە هەموو کردەوە ناپەسەندەکانی و وائەزانێ تەمەنی هەر تەنیا ئەو کاتەیە تێیدا ئەژی.

پۆلیس چاوی لێی نەبێ هیچ چاودێرییەکی نهێنـی و (غـەیبی)ی تری بەسەرەوە نییە، بۆیە چی بکـات ئـەیکات و کـۆ لـە هـیچ شت ناکاتەوە.. ئەمە لە کوێ و ئەو مرۆڤە مووسوڵمانە لە کوێ ئەگـەر دراوسێکەی شـەو بـە برسـێتی سـەری نایـەوە یـان دارێکـی دا لـە گوێدرێژەکەی خۆی بە تاوانبار ئەزانێ، بەرامبەر ئاین و خوا.[٤٧]

ئەمە بە نیسبەت تاکەوە. با زۆر بە پەلەیش سـەیرێکی سـەرپێیی مێژووی گەلانی مووسوڵمان بکەین، بۆئەوەی بزانین ئایـا ڕاسـتە،

---

[٤٦] شبهات حول الاسلام، فصل الدين افيون الشعوب، ص١٧١.

[٤٧] حيوار مع صديق الملحد، هل الدين افيون؟ ص٣٥.

ئایین، ئاینی ئیسلام، تریاك بووه و گەلانی بەنج کردووه و کۆتی کردوون و نەیهێشتووه داوای ماڤی ڕەوای خۆیان بکەن .
ئەوەی ڕاستی بێ هەرکەسە سەیرێکی مێژووی کۆن و نوێی گەلانی مووسوڵمان بکات، ئەبینێت هەموو کاتێ ئاین هەوێنی هەموو شۆڕشێك و دەنگی ئازادی و هەڵگیرسێنەری سۆزی ڕزگاریخوازی ئەم گەلانە بووە، چۆن وازی لێ ئەهێنین و ئەیدەینە دەستی مێژووی کۆن و مۆزەخانە، بەڵام دێینە سەر مێژووی تازەی ئەم گەلانەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە دڵ و دەروونیاندا ئەگرێ، سەیر ئەکەین هەموو شۆڕشێك، هەموو ڕاپەڕینێکی گەل، هەموو دەنگێکی داوای ماف، ئیسلام و زانایانی ئاینی ئیسلام هەڵگیرسێنەر و سەرۆکی بڵێسە و نەخشەکێشی شۆڕشەکە بون .
وا لە خوارەوە چەند نموونەیەکی ئەخەینە بەردەست خوێنەوارانی بەڕێز، بە هیوای لێکۆڵینەوەی ڕاستی و ناڕاستی مەسەلەکە بن:
أ- کاتێ لە ساڵی ۱۷۹۹ ناپلیۆن یەکەم هێرشی هێنایە سەر میصر، نووستبون و پرخەی خەویان ئەمپەڕ و ئەوپەڕی وڵاتیانی گرتبووەوە و هیچ کەسێ بەرەنگاری ئەم هێرشەی نەکرد و دانەبەزی بۆ گۆڕەپانی فیداکاری، جگە لە زاناکانی

ئیسلام و زانایانی ـ ئەزهەر ـ ی پیرۆز نەبێ، بەڵێ تەنیا زاناکانی ئەزهەر بون توانییان گیانی غەزاو هەستی فیداکاری لە دەروونی لاوەکـانی میصـردا ببـزوێنن، بەمەیشـەوە نەوەسـتان هـەتا کاربەدەستانی وڵاتیان لە کونی ژووری ڕابواردن دەرپەڕاندو بە هـەموویان و لـە ژێـر فەرمانـدەی زانـا ئاینییەکانـدا، بـەرەو گۆڕەپانی جیهاد کەوتنەڕێ و ملیان شۆڕ نەکرد بۆ دوژمن وەکو جوجەڵە بیانگرێت، بەڵکو بست بە ست هەر لە قەراغی دەریای سپی ناوەڕاست، لەگەڵ ناپیلیۆن و سوپا داگیرکەرەکەی جەنگان هـەتا هاتنـە نـاو گۆڕەپـانی ئەزهـەری پـیرۆزەوە، بـەڵام دوژمنـی چەپەڵ ڕێـزی ئەزهـەری نەگرت و مامۆستاکانی ئەزهـەری لەناو مزگەوتەکەدا دەرهێناو لەبەردەم مزگەوتەکەدا هەڵیواسین.(٤٨)

ب ـ زۆربـەمان شۆڕشـی ڕزگـاریخوازی جـەزائیرمان لـەبیردێت و هەڵوێسـتی گیانبـازیی ڕۆڵـەکانی جـەزائیر بەرامبـەر بـە ئیمپریالیزمی فەرەنسی داگیرکەر(٤٩)

پرسیار بکە لە مێژوونووسە ڕاستەکان و ئەو پیاوە ڕامیارییانەی کـە جاربـەجار سەرسـم لـە ڕاسـتی نـەدەن، بـزانن پاڵـەوانانی

---

٤٨ حركة الاسلام ومفكر الغرب، د. محسن عبدالحميد، ص٤٤.

٤٩ بەڵێ ئەو فەرەنسایەی کە مافی مرۆڤی کارتۆنی لای ئەوان سەری دەرهێنا، کەچی خۆیان هەموو مافێکی مرۆڤی جەزائیر، بەڵکو مرۆڤەکەی خۆیشیان، پێشێل کردبوو.

هەڵکردنی ئاگری شۆڕشی جەزائیر کێ بون، دیارە کە هـەموویان دەڵێن زانایـانی پـیرۆزی ئیسـلام بون، ئایا هـەر زانایـانی ئـایین نـەبون و بـە نـاوی ئایینـەوە نـەبوو هەسـتی ولاتپـەروەرییان لـە گیانی لاوانی جەزائیردا خرۆشان ؟

زمـانی عـەرەبی، کـە زمـانی زکمـاکی خۆیـان بـوو، خوێنـدن و نووسین بە هەموو شێوەیەك قەدەغە بوو، چونکە زمانی ڕەسمی زمانی خوێنـدن و تەنانەت زمانی بازرگانییـان، زمانی فەرەنسی بوو، ئەو تاقە جێگایـەی کـە پارێزگـاریی زمانەکەیانی ئەکرد و ڕۆڵـەکانی فێـری زمانەکـەیان ئەکرد، بریتـی بـوو لـە قوتابخانـە ئایینییە ئەهلییەکان [٥٠]

هەرکەسە ئەگەر چی بە سەرپێییش بێ سەیری شۆڕشی جەزائیر و چـۆنیەتی ڕزگـاربونی جـەزائیر بکـات، نـاوی مامۆسـتای شۆڕشگێڕەکان، ھاندەری لاوەکان (شێخ عبدالحەمید بادیس)، بە گەورەیی بەدی ئەکات، (ئیمام بن بادیس) دروشمێکی نووسی و دایە دەست لاوانی جەزائیر هەتا ئاڵای ڕزگارییان پێ هەڵ نەکرد، وازیـان نـەهێنا، دروشمەکـەش (ئیسـلام ئاینمـە، جـەزائیر نیشتمانمە، عەرەبی زمانمە) بوو [٥١]

---

[٥٠] وەکو زمانی کوردی و حوجرەی فەقێی جاران .

[٥١] حركة الاسلام ومفكر الغرب، ص٦.

بـن بـاديس بەشـێوەيەك ڕۆڵـەكانی جـەزائیری لـە فێڵـەكانی ئیمپریالیزم ئاگاداركردەوە كە ئەیوت.(٥٢)

وەڵڵاهي ئەگەر فەرەنسا داوای وتنی (لا اله الا الله)م لێ بكات نایڵێم، چونكە ئەو (لا الـه الا الله)یە بێ مەرامەت نییە و فێڵە لە مووسوڵمانە ساویلكەكان. ئـەی كـەس هەیـە بتوانـێ هەڵوێستی شۆڕشـگێڕانە و ئیسـلامییانەی (عەبـدولقادر جـەزائیری) لــە مێـژووی شۆڕشــی جـەزائیردا بسـڕێتەوە، قورئـانی گـرت بـە دەستیەوە و بانگەوازی غەزای كرد دژی ئیمپریالیزمی داگیركەر. ئـەی كـەس هەیـە بتوانـێ چـاو بنوقێنـێ لـە ڕاسـتی شۆڕشـی مووسـوڵمانەكانی هیندسـتان بەرانبـەر بـە ئینگلیـزی داگیركـەر، هـەتا گەیشـتە ڕادەیـەك لـە یـەك پۆسـتەی كـاروانی شـەهیدانی ئیسـلامدا (٣٠.٠٠٠) لاوی موسـڵمان بەشـێوەی كۆمـەڵ شـەهید كران .

ئایا ماركس یـان هـەر خەڵـەفاوێكی تـری وەك (مـاركس) ڕاسـت ئەكات ئەڵێ: ئاین تریاكی گەلانە، ئایا ئیسلامیش هەروایە؟

ئەگەر بگەڕێینـەوە بۆ عێـراق و هـەموو ڕاپەڕینـە گەلییـەكانی، سەیر ئەكەین زاناكانی ئایینی پێشەوای كاروانی شەهیدان بون. ئێستاش زۆر كەس تابلۆی ڕیشیی خوێنـاوی مـەلای لە دەسـتی

---

٥٢ ابن باديس و عروبة الجزائر، محمد الميلي، ل٦٣، ٦٤.

ئینگلیـز کـه لـه ڕاپەڕینەکـەی حـوزەیرانی (۱۹۲۰) لـه خـوارووی عێـراق ڕووی دا، خۆنەگـەر زانـای ئـایینی دەرچـووانی حـوجره دەربکەین لە شۆڕشگێڕانی کوردستان، هـەر لـە دێـرین زەمانـەوه هـەتا ئـەمڕۆ، جگـه لـه سـفرێکی زەق نـەبێ هیچمان بەدەستەوه نامێنێ؟! به خوێندنەوەی مێژووی شۆڕشگێڕانی کورد.(٥٣) ئەم ڕاستییەمان وەکـو هـەتاو بۆ دەرئەکـەوێ، کاتـێ کـه زمـانی کوردی له ئێران و له تورکیاو له سوریا قەدەغه کرا، کون نـەبوو خۆی تێدا بگرێ، ئایا جگه له مزگەوت و پیاوانی مزگـەوت کـێ دالـدەی داو خەملانـدی و کەلـەپورێکی پـڕ لـه شـانازی بـۆ پاشەکەوت کرد (خست)؟!

دیاره هیچ کەسێ له ئاستی ئەم ڕاستییانه چاوی خۆی کوێر ناکـات، مەگـەر کەسـێ چـاویلکەی لـه سـەربازگەی (کـوفر)ەوه ڕۆژهەلات یا ڕۆژئاوا، بۆ هاتبێ (٥٤)

---

[53] بۆ نموونه سەیری کتێبی شۆڕشەکانی کورد و وەکوردو کۆماری عێراق علاء الدین سجادی و شەرەفخانی بەدلیسی مشاهر الاکراد محمد امین زکی بەگ بکه.

[54] پیرەمێردی فەیلەسوف چەند جوانی فەرمووه لەو چامەیەیدا که بۆ شەهیدانی کوردستان ئەڵێ:

هاتن شەهیدەکان به جلی سوری خوێنەوه — دایکی وەتەن هەڵسه سڵاویان بسێنەوه

(شێخ قادره) له پێشەوه سەرقافڵەی ئەوان — چەند جوانه خوێن و ڕیشی سپی پیرو نەوجوان

سەیری ئەمانه که هەموو کوردی حسن شکەن — گیانیان پێشکەش ئەکردو ئەیانوت بژی وەتەن

وەرە مێژووی ڕاستەقینەی ئەم گەلە موسڵمانانە بە هەموو زان و نەتەوە و هۆز و کۆڕێکەوە بخوێنەرەوە، هەڵوێستە شۆڕشگێڕانەکانیان بە پێنووسێکی سوور دیاری بکە زۆر بە ئاسانی بۆت دەردەکەوێ کە ئیسلام بەنزینی شۆڕشەکەیان بووە، زانایانی ئایین و خواپەرست پێشمەرگەی شۆڕشەکە و قۆچی قوربانی ڕاپەڕینەکە بون..

ئەی ئێران و قەڵای فیرعەونی پەهلەوی کە زیاتر لە دوو هەزار ساڵە ڕەگی داکوتاوە، ئەگەر ئیسلام و ئاینی ئیسلام نەبوو، چی پاڵی بە قوتابی زانکۆکانی تاران و شارەکانی ترەوە ئەنا خۆیان فڕێ بدەنە ژێر پێی دەبابە کاتێ سەربازەکانی حەمەڕەزا شای بۆگەن بە شەستیر دەوری کۆمەڵێکی ئەگرت، کۆمەڵێکی تر ئەهاتن و بە سرودی (الله أكبر) بە زەردەخەنەوە پێشوازییان لە مەرگ ئەکرد، هەتا هەر بە چەپڵە و هاوار و خۆپیشاندان، ئەو دەوڵەتە گەورەیە و هەموو سازمان و ساواك و مخابەراتی ئەمریکی و بەکرێگیراو و چڵکاوخۆری شاهەنشایان ڕووخاند، بە شێوەیەك بە نەخشەی هیچ بلیمەتێکی سەرزەویدا نەدەهات، هەریەکە لە ئاستی خۆی حەپەسسابوو، چۆن؟!

چۆن شاهەنشای ئێران ڕووخا و کۆماری ئیسلامی لە ئێراندا ڕەگی داکوتا.. ئیتر کامەیە تریاك ـ مام مارکس ـ؟

ئایا مسوڵمانەکان تریاك خۆر و بەنگ کێشن، یان ئەندامەکانی حزبی شیوعی کە بۆ کورسی وەزارەت و ئەمینداریێتی گشتی خوێنی هەموو کوژراوەکانی حیزبیان خستە ژێر تایەی مرسیدسەکانیانەوە، بەڵێ مرسیدس ٧٦ی چینی پڕۆلیتاری کوردی و شەقامەکانی ابو نواس بازاڕەکانی بەغدا.

٣. لای ئەوروپا و قوتابیانی کوفر، قۆناغی ئایین تەواو بووە و ئیتر مرۆۆ پێویستی بە ئایین نییە .

ئەوەتا (فرۆیـد) قۆناغـەکانی مێـژووی ئـادەمیزادان لـە ڕووی سایکۆلۆژییەوە ئەکات بە سێ قۆناغەوە، هەر قۆناغێك هاتە پێشەوە قۆناغەکەی تر باوی نامێنێ .

قۆناغی یەکەم : ئەفسانەپەرستی و ڕێـزگاوی و خورافیات،

قۆناغی دووەم : ئایین .

قۆناغی سێهەم : دوا قۆناغی مرۆڤایەتی، قۆناغی زانیارییە.[٥٥]

کەواتە لەو کاتەوە قۆناغی زانیاری دەستی پێکردووە، ئەبێ قۆناغی ئایین تەواو بووبێ، خۆ هەرکەسێك شوێن ئایین بکەوێت واتە شوێن شتێکی پووچ و بێ مانا کەوتووە، خۆی بە شتێکی دوور لە ژیانی هاوچەرخەوە خەریك کردووە، هەر لەبەر ئەم خاڵەیە بە خواپەرست و ئایین پەروەرەکان ئەڵێن کۆنەپەرست،

[٥٥] شبهات حول الاسلام، د.محمد قطب، ص١٢.

چا ئێستا با بزانین ڕاسته كه ئایینی ئیسلام باوی نهماوه و پێیوستمان پێی نهماوه؟

ئایا ڕاسته مووسوڵمانهكان كۆنهپهرستن ؟

یان ڕاسته كه ئایین ئێستاو لهم قۆناغهی ئێستا و لهم مێژووه تازهدا، دهور نابینێ ؟

ئهوانهی وا ئهزانن ئیسلام باوی نهماوه و پێویستمان پێی نهماوه، ئهو ههژارانهن كه ههر ئهوهندهیان له ئیسلام پێگهیشتووه و وهكو له قوتابخانهدا خوێندوویانه و وا ئهزانن ئایینی ئیسلام له كاتێكی تایبهتی و بۆ ناو گهلێكی نهفام و بتپهرست هاتووهته خوارهوه، بۆ ئهوهی له بتپهرستی بیانگهڕێنێتهوه و نههێڵێ "كچهكانیان زیندهبهچاڵ بكهن"، یان وا تێگهیشتوون ههموو ئامانجی ئیسلام ئهوهبوو كه عهرهب له چهند خێڵێكی پچڕ پچڕ و چهند هۆزێكی دوژمنكاری ناوخۆییهوه بكاته یهكپارچه و عهرهق و قوماریان لێ قهدهغه بكات.

دیاره خۆ ئهمانهش ههموو جێبهجێ كراون، كهواته ئهو ئامانجه كه ئاینی ئیسلامی بۆ هاتووه، هاتوونهته جێگا و ئێستاش نه بتپهرست ماوه و نه باوی تالان و بڕۆی هۆزچێتی عهشایهری و نه كهس كچ زیندهبهچاڵ ئهكات. كهواته

پێویستمان بە ئایین نەماوە، بەرشێوەیە قۆناغی ئایین تەواو بووە گوێزرایەوە بۆ لاپەڕەکانی مێژوو و کونجی مۆزەخانە.

بەڵام لە ڕاستییدا ئەوانەی بەوشێوەیە سەیری ئیسلام ئەکەن، هیچ لە ئیسلام نازانن، لە هاتنی ئیسلام و قورئان چی بووە؟

## ئیسلام بۆچی هاتووە ؟

ئیسلام بۆ چەسپاندنی یەك تاقە وشە هاتۆتە خوارەوە، کە ئەو وشەیەش بریتییە لە (ڕزگاری)، ڕزگاریی مرۆڤ لە ئارەزووکاری، ڕزگاریی مرۆڤ لەژێرچەپۆکی مرۆڤ ، ڕزگاریی مرۆڤ تەنانەت لە ترسی مردنیش، مەبەستمان لە ڕزگاریی مرۆڤ لە ئارەزووکاری ئەوەیە هیچ ئارەزوو و حەزێك نەتوانێ لە ڕێڕەوی خۆی، کە خەلیفەی خوایە، لای بدات، تەنانەت خۆشەویستی و شەهوەتی ژیانیش، چونکە زۆرجار خۆشەویستی ژیان و ترسان لە مردن ئەبێتە هۆی سەرشۆڕکردنی مرۆڤ بۆ مرۆڤێکی تری وەك خۆی، وەکو خۆی لە مرۆڤایەتیدا، وەکو خۆی بێ هێز و بێدەسەڵات بەرانبەر هەموو جۆرە سزایەکی خوایی، ئایا ئەم شێوەی چەوساندنەوەی کە ئێستا بە ناوی ڕژێمەکانی سەدەی بیستی پێشکەوتن خوازەوە ئەکرێت و دۆزەخترین شێوەی سزا پیشانی مرۆڤ ئەدرێت، ئایا لە پێش هاتنی ئیسلامدا و لە دەوری نەفامێتی عەرەبدا ئەم جۆرە چەوسانەوە هەبوو یان نا؟

ئایا مرۆڤ لەم چەرخەدا زیاتر لە هەموو چەرخێك ژێر دەستەتر و ئاتاجتری ڕزگاری نییە ؟

دیارە بەڵێ، خۆ هەتا تاقە مرۆڤێکی ئەم ئەستێرەی ئادەمیزادانە ژێردەستەبێ و مرۆڤی تر، ئیتر بە هەر شێوەیەك و بە هەر

ناوێکـەوە بچەوسـێنرێتەوە ئیسـلام دەوری هەرئـەمێنێ. مرۆڤـی سەرلێشـێواوی سـەدەی بیسـت زیـاتر لـە پێویسـتی بـۆ هـەوای ئۆکسجینی، ئاتاجی ئیسلامە، چونکە پاش مردن پێویستی بە ئۆکسـجین نـامێنی، بـەلام پـاش مـردنیش پێویسـتی بـە ئیسـلام هەیـە، ئایـا کـە شارسـتانیەتی ماددیـەت و قوتابیـانی ـ فرۆیـد ـ خۆیـان لـە بـاوەڕ بـە خـوا داڕنـی، قازانجیـان کـردو پشـوویان دا؟ نـالێم فلانـە شـێخ یـان فلانـە مـەلا لـەم بارەیـەوە ئـەڵێ قازانجیـان نـەکرد، بەڵکو وا لـە خوارەوە هـاواری نووسـەرێکی جیهـانی زۆر بەرز و ژیاوی شارستانیەتی ماددیەت بە هـەردوو بەشـەکەیەوە و سەربازێکی کۆمۆنیستی ئەوسا و هەڵگری خەلاتی نۆبڵی ئێستا، ئەخەینـە بەردەسـتتان، کوردواتـەنی، ئێـوەش خۆتـان و خـوای خۆتـان، ئـەو نووسـەرەش (سۆلجەرنتسـن)ە، سۆلجەرنتسـنی ڕوسی وەك نووسەرێکی ئاسایی لە ڕوسیادا نەژیاوە، کونجێکی ژیان بگرێت و بنووسێت، بەڵکو لەگەڵ هـەموو شـەپۆلێکی تـاڵ و سوێری ژیـانی ڕوسـی و گـەلی ڕوسـیدا ژیـاوە و هـەر لـە چـەرخی برسـێتی ڕوسـیا هـەتا چەرخی دیکتـاتۆرێتی سـتالین، لـە هـەموو قۆناغـەکانی گۆڕانـدنی ڕواڵـەتی ژیـانی ڕوسـیادا ژیـاوە، چەرمەسەرییەکان و تەپارتلی گەلەکەی قوتابخانەی بووە و فێری نووسـین و بیرکردنـەوەی کـردووە و سـەربازێکی گیانبـازی

ولاتهکهی بووه، چهکی ڕووبهڕووی دوژمن ههڵگرتووه و ژیانی ئاوارهیی و برسێتی و تینوێتی سهربازیشی تاقی کردۆتهوه، کاتێ وهك نووسهرێکی سهربهست پهنجهی بۆ (دیکتاتۆریهتی شیوعی) ڕاکێشاوه تووشی بهند و کۆت و کهلهپچه هات بهوهیشهوه نهیانهێشت بهڵکو وتیان شێت بووه و وهکو ههر نووسهرێکی تر که دهنگی ئازادی له ڕوسیادا بهرز بکاتهوه، خهڵاتی شێتێتی پێ ئهبهخشن، خستیانه شێتخانه، لهم کاتهی ژیانی بهندێتیی شێتخانهیدا گهلێك نووسین و ڕۆمانی ـ ریوایه ـ ی ئهنارده ڕۆژئاواو لهوێ بڵاویان ئهکردهوه و ئهگۆڕدرایه سهر زۆربهی زمانهکانی بێگانه، لهم کاتانهدا هێرشی زۆر زلهی زلهی ئهکرده سهر یاسای کۆمۆنیستی به گشتی و ڕوسیا بهتایبهتی.

لهم کاتی بهندییهدا بوو خهڵاتی نۆبڵی پێبهخشرا، کاتێ ڕوسیا زانی ئهم کابرایهی پێ بێدهنگ ناکرێ و ئابڕووی بۆ خۆیی و بیروباوهڕی کۆمۆنیستی نههێشتووه، بڕیاری دهکردنی سۆلجهرنیتسنی دا، له ڕوسیا دهرکراو بهوجۆره له نیشتمانی خۆی شاربهدهر بوو، بهدهرچوونی له ڕوسیا و هاتنی بۆ ڕۆژئاوا، چهند کتێبێکی زۆر بهرزی دهرکردو تیایدا باسی لێقهومان و قوڕبهسهری گهلی ڕوسی ههژاری کرد بهدهست یاسای دیکتاتۆری مارکسایهتییهوه، بهناوبانگترین ئهو کتێبانهی،

کتـێبی (ئەرخـەبیل گـولاج)ە، ئەرخـەبیلیش نـاوی یەکێکـە لـەو بەندیخانانەی کە ئازادیخوازانی ڕوسیا بەدەست ڕژێمـی ئـەمڕۆی ڕوسەوە تێیـدا ئـەناڵێنن، مەبەست لـەو کتێبـە و ناونیشـانی ئـەو کتێبە ئەوەیە کە بەندیخانەکانی ڕژێمـی ڕوسیا وەکو دوورگـەی پـەرش و بـڵاوی نێـو دەریـا، هـەموو شـوێنێکی وڵاتـی ڕوسـیایان گرتۆتەوە.

بەڵێ بەو شێوەیە گێژەڵووکەی ژیان سۆلجەرنیتسن ی وەکو قتگەلاشـک خولانـدەوە هـەتا لـە ئـەمریکا دای بەزەویـدا. سۆلجەرنیتسـن وای ئـەزانی سـاڵی ١٩٧٤ ئـەو سـاڵەیە کـە لـە دیکتـاتۆری کۆمۆنیسـتان ڕزگـاری ئـەبێ بـۆ بەهەشـتی ڕۆژئـاوا، چونکە کوردواتەنی: دەنگی دەهۆڵ لە دەوورەوە خۆشە. بریسک و هوڕی شارستانیەتی ڕۆژئاوا و سەربەستی و بەرەلایی ڕۆژئاوا زۆر سۆلجەرنیتسنی سەرسام کردبوو، بەڵام ئایا وایە؟

ئایا وایە ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەلات باشترە؟

ئایـا دیکتاتۆریـەتی سـەرمایەداری لـە دیکتاتۆریـەتی سـوری کۆمۆنیستی باشترە؟ یان

ئایا وایە سۆلجەرنیتسن ئەخەڵەتێ ؟

ئەبێ لەمەولا چی بنووسێ و چی بڵێ، ئایا لەمەودوا ئیتر ئەبێتە شایەری ڕۆژئاوا و گـۆرانی و سـتایش بەشـان و بـاڵی ڕۆژئـاوادا

ئەڵێ ؟ ئەم پرسیارانە لە مێشکی زۆر لە نووسەرانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ویڵـی وەڵام بـوو، هـەتا ئەمسـاڵی ١٩٧٨ گـەورەترین زانکۆی ئـەمریکی، زانکـۆی (هارڤـارد)، بڕیـاری دا بڕوانامـەی دکتـۆرای شـانازی (فـەخری)ی بـە سۆلجەرنیتسـن ببەخشـێت، ڕۆژی وەرگرتنی بڕوانامەکە هـەزاران کـەس گـوێ قـوڵاخ بـون کـە سۆلجەرنیتسن ئەبێ چی بڵێ؟

زۆر کەس خۆی ئامادە کردبوو سۆلجەرنیتسـن تـەنها هێرش بۆ سـەر کۆمۆنیسـت و مارکسایەتی بکـات و سـوپاس و ستایشـی بـەرەی ڕۆژئاوا بکات، چونکە خانـەخوێ بـون و داڵـدەیان داوە، بـەڵام بـە پێچـەوانەوە وتـارێکی زۆر بـەرزی مێـژوویی داوە و ناڕاستی بەرنامەی ژیـان و واقیعـی هـەردوو بەرەکە، ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاوای تێدا باس کردووە. ئەو وتارە بووە قەواڵەیەك و کۆڕا بۆ زۆربـەی زمانـەکانی جیهـان، بـەڵێ بـووە قەواڵەیـەك، چـونکە سۆلجەرنیتسـن وەکـو حەکـەمێکی گۆڕەپـانی هـەردوو یاسـاکە، کۆمۆنیستی ڕوسی و سەرمایەداریی خۆرئاوایی ئەمـەریکی، زۆر بە باشی ئاگادار و شارەزای کاکڵەی هەردووکیان بوو، پسـپۆڕانە پەنجـەی بـۆ ڕووخانـدن و گسـکدانی باخـەڵی هـەردووکیان درێـژ ئەکرد، سۆلجەرنیتسن لە وتارەکەیدا وتی:

رۆژئاوا و شارستانێتی ئەورووپا بەرەو نەمان ئەڕوات لەبەر چوار هۆی سەرەکی:

١. ڕابـواردنی مـاددی: وڵاتـه کۆمۆنیسـتەکان باوەڕیـان بـه خـوا نەماوە و ڕەوشـت و گیـان (رۆح) نرخـی نییه، چونکه فەلسـەفەی ڕێبـازی وڵاتەکـەیان هەروایـه. ڕۆژئـاواییش تووشـی هـەمان درم بون و لـه ئیلحاددا بـه یـەکتری ئەگەنـەوە، شارسـتانییەکیش بـەم شێوەیه چڵێس بیٚ، هـەر خـەریکی هەڵپـە و گـەڕان بـیٚ بـه دوای ڕابواردنی ئاژەڵیدا، دیاره هەرگیز ڕۆڵەکانی ئامادەی قوربانی نین و شارستانییەکی ترسنۆك دەرئەچێت و هـەر ڕۆژەی بەشێوەیەك مل بـۆ دوژمنەکـەی خـۆی کـەچ ئەکات هـەتا سـواری ملـی ببیٚ، چونکه ئەیەویٚ کۆتی و سەلامەت بژی.

٢. ترسـان لـه مـردن: ڕۆژئـاوا وەك شەمشـەمه کوێره لـه تیشـکی ئایین هەڵهات، ئەمەش بووه هۆی ئەوەی کـه گیانی لەخۆبردن و فیـداکاری لەدەسـت دەربچێت، بـەڵام ئەیانـەوێ بژین، ئیتر چۆن ئەژین گرنگ نییه .

سۆلجەرنیتسـن لـەم بـارەوە نموونەیـەکی جـوان ئەهێنێتـەوە و ئەڵیٚ: هەر لەبەر ئەمەیشه سـەیر ئەکـەین لـەم سـەدەی بیستەمەدا هـیچ جـەنگێك نـەبووه تووشـی ڕۆژئاواییـەکان بووبـیٚ و تێیـدا سـەرکەوتوو بـن، بـەڵکو لـه هـەموو جەنگەکانیدا پـەناو هـاواری

بردۆتـه بـەر وڵاتێکـی تـر بۆ ئـەوەی یارمـەتی بـدات، لـه جـەنگی جیهانی یەکەمدا پەنای بردە بەر ڕوسیای قەیسەری، کە ئەو کاتە ڕوسیا لە چاو ئەماندا نە دەوڵەت بوو، نە خاوەن هیچ یاسا و ڕژێمێك بوو.

لـه جـەنگی جیهـانی دووهـەم (جـەنگی هیتلـەر) دا، لەبەرئـەوەی ڕۆژئاواییەکان ترسنۆك بون، هەر چەك و جبەخانەیەکی چاکیان هەبوو دایان بە سۆڤیەت. ڕوسیای شیوعی .. بەڵێ ڕوسیا توانی زاڵ بێت بەسەر هیتلەردا، خۆ ئەگەر گیانی لێبوردن لە ڕۆژئاوادا زیندەبەچاڵ نەکرایـە، ڕۆژئاواییەکان خۆیان ئەیانتوانی هیتلـەر لەناوبەرن و نیوەی ئەورووپاشیان لەدەست دەرنەچێت، بەڵام ئایا تەنیا بە لەدەست دەرچوونی نیوەی ئەورووپا کۆتایی پیّ هات...؟ دیارە نەخێر، بەڵکو ڕوسیا بووە ملۆزمێك بۆ ڕۆژئـاوا، هـەر ڕۆژە وەکو گیسکەکەی هەیاس ئەیانباتەوە بە قابلۆخەی خۆیاندا.

٣. ڕۆژئـاوا کەسـایەتی خـۆی ون کـردووە، هـەموو ڕۆژئاواییـەکان بـە سـەرۆك و ئەندامـەکانی کۆمەڵیانـەوە و تـابلۆی کـەم هێزیـی، وەکو مێردزمە سواریان بووە.

٤. سـۆلجەرنیتسـن ئـەڵێ: گـەورەترین پەڵەیـەك لـه شارسـتانیەتی ئەورووپادا کـە ڕۆژئاواییـەکان شـانازیی پێـوە بکـەن، وردەکارییـان لـه گوێڕایـەڵی یاسـادا و جێبـەجێ کردنـی یاسـا زۆر بـه وردییـه،

بەڵام یاسا وەکو خێرخواە ئەپارێزێ، هەمان یاسا لە ڕۆژئاوادا خراپەکاریش ئەپارێزێ، چونکە دەوڵەت گیری خواردووە بە دەست چۆنێتی جێبەجێکردنی ( تطبیق ) یاساوە، بۆ نموونە ئەگەر . کۆنفرانسی ئەمریکی . بیەوێ یاسایەك دانێ بۆ پارێزگاریی وزە . طاقة . نە تاکەکان بە گوێی ئەکەن بەوەی هەندێ لە ڕابواردنی ڕۆژانەی خۆیان پێشێل بکەن، نە کۆمپانیا گشتییەکانیان بەگوێی ئەکەن و بەرژەوەندی گشتی ئەخەنە پێش چاوی خۆیان، ئیتر سەرۆکی وڵاتەکە دەستەوئەژنۆ لێی دائەنیشێ، چونکە کۆمپانیاکان بەشێوەیەك زاڵن بەسەر دەوڵەتدا ڕۆژ تا ئێوارە پیاوانی ڕامیاریی وڵات هەوڵی ڕازی کردنی کۆمپانیاکان ئەدەن، بۆ ئەوەی بمێننەوە.

لەبەر ئەمانە ئەبینین پیاوانی مێژوویی و هەڵکەوت و لە ڕۆژئاوادا ون بون، لەلایەکەوە و لەلایەکی ترەوە لە شارستانیەتی ترسنۆکیدا ئەژین.[٥٦]

جا پاش ئەوەی گوێمان لە سۆلجەرنیتسن گرت، منیش ئەڵێم: ئێوەش خۆتان و خوای خۆتان.... بۆ ئەوانەی کە ئەڵێن دەوری نەماوە، تاقە پرسیارێکم هەیە ئایا چی لە ئیسرائیلدا ئەو هەموو خەڵکەی کۆکردۆتەوە کە هەریەکەیان هەڵگری نەژادنامەیەکی

---

[٥٦] ئەم باسەم لە گۆڤاری (العربي) کوێت، ژمارە: ٢٣٧ مانگی ئابی ١٩٧٨ وەرگرتووە.

جیاجیان و هەریەکەیان لەمپەر و لەرپەڕی سەرزەوی کۆبونەتەوە و زۆربەی دراوسێکان لە زمانی یەکتری ناگەن و هەریەکەیان جۆرە ڕەنگێك و .... هتد

چی کۆی کردونەتەوە و بە چەند ملیۆنێکی کەمەوە لەرزووتایان بۆ ناوچەکە بەتایبەتی و بۆ جیهان بە گشتی، بڕیوە؟!

## هەڵوێستی شارستانیەتی ماددییەت بەرانبەر بە بیروباوەڕی ئیسلامی :

لەبەرئەوەی شارستانیەتی ماددییەت (کوفر) دوو سەنگەری هەیە ، سەنگەرێکیان بە کفری ڕۆژئاوا ناسراوە، ئەویتریان بە کوفری سوور یان کوفری ڕۆژهەلات ناسراوە .

دیسان لەبەرئەوە هەریەکەیان جۆرە هەڵوێستێکی تایبەتی خۆی هەیە بەرانبەر بە ئیسلام و گەلانی مووسوڵمان هەریەکەیان بەجیا باس ئەکەین. لەپێشەوە دێینە سەر هەڵوێستی کوفری ڕۆژئاوا، دوایی هەڵوێستی کوفری سووریش باس ئەکەین، کافرەکانی خۆرئاوا هەرچەندە بە دڵێکی زۆر پڕ لە قینەوە ڕوویان نا بەرەو ولاتە ئیسلامییەکان، بەلام زۆر زۆلانە ڕوویان نا، لە پێشدا هاتن شارەزاییەکی تەواویان لە خووڕەوشت و هۆی دەمارگیری و چۆنێتی خەڵەتاندنی مووسوڵمانەکانی پەیدا کرد، سەرچاوەی باوەڕ و پاڵەپەستۆی شۆڕش و ڕاپەڕینەکانیان دۆزییەوە، ئەمجا نەخشەیەکی زۆر وردیان کێشا بۆ هێرش هێنان و جا تەشریفی ناخێریان هێنا لە ساڵی ١٨٨٢ کە ئینگلیز توانی شۆڕشی ئیسلامی (عەرابی) لە میسر کپ بکاتەوە و باڵی ڕەشی بکێشێ بەسەر ولاتەکەدا .

زۆر لێیان ڕوون بوو که‌ ته‌وژمی باوه‌ڕی ئیسلامی له‌ هه‌ر دڵێکدا په‌نگی خواردووه‌، به‌ شۆڕش نه‌بێ دانامرکێ، (مجلس العموم)ی به‌ریتانی به‌ سه‌رۆکایه‌تی سه‌رۆکوه‌زیران . گلادستۆن . کۆنگره‌یه‌کی زۆر گه‌وره‌ی به‌ست، پاشانیش که‌ . فیکتۆریا . بوو به‌ هاوبه‌شی کردن بۆ دانانی نه‌خشه‌ی چۆنێتی دزینی لاوه‌کانی ئیسلام و یه‌خسیرکردنیان بۆ کارگوزاریی خۆیان له‌ کۆنگره‌که‌دا (گلادستۆن) قورئانێکی پیرۆزی به‌رزکرده‌وه‌ و وتی هه‌تا ئه‌م کتێبه‌ له‌ناو میسرییه‌کاندا بمێنێ و سه‌رمه‌شقی ژیانیان بێ، ئێمه‌ش ناتوانین له‌و خاکه‌ ڕه‌گ داکوتین و نیشته‌جێ ببین، که‌واته‌ پێویسته‌ ڕێبازێکی ڕامیاریی په‌روه‌رده‌یان بۆ دابنێین که‌ ئاین و . ئه‌م کتێبه‌ . له‌ پێش چاویان سووك بکات و هه‌رچی پیرۆزی و ڕێزی ئه‌م کتێبه‌ هه‌یه‌ له‌ ده‌روونیانا نه‌مێنێ.[٥٧]

به‌ڵێ ئینگلیز ڕامیاریی زانستی له‌ میسردا له‌ ژێر ئه‌م نه‌خشه‌یه‌دا داڕێژا، ئه‌مان وه‌کو شیوعییه‌کانی لای خۆمان نه‌هاتن یه‌کسه‌ر داوای لابردنی ده‌رسی ئایین بکه‌ن له‌ قوتابخانه‌کاندا، ده‌رسی ئایینیان هێشته‌وه‌، به‌ڵام کام ئایینه‌ ئه‌خوێنرا ؟

---

[٥٧] ته‌فسیری خاڵ، شێخ محه‌مه‌دی خاڵ، به‌رگی یه‌که‌م، وه‌ کتێبی شبهات حول الاسلام، د. محمد قطب، ص٨، ٩.

ئەو ئیسلامە ئەخوێنرا تەنیا بریتی بێ لە نوێژکردن و زەکات و سەرفیتره... ئەو ئیسلامە ئەخوێنرا کە بریتی بێ لە کێلی گۆڕستان ماچکردن و پەڕۆی سەوز هەڵگرتن و هۆنینەوە تەسبیحی (۱۰۱) دەنکی، ئەو ئیسلامە ئەخوێنرا کە بریتی بێ لە مارەکەی دۆزەخ و حەفتا حۆرییەکەی بەهەشت و لەبەرکردنی ناوی جنۆکە و هاڵ و شەوە، قورئان تەنیا بۆ بەرەکەت ئەخوێنراوە بۆ پاسی کێڵگەکان، ئەگینا ئیسلام کە بریتی بێ لە یاسایەکی تایبەتی بۆ پەروەردە و زانیاری و پێگەیاندنی لاوانی قورئان، ئەگینا ئیسلام کە بریتی بێ لە ژیان و جڵەوبەدەستی ژیان، ئەمانە نەك قوتابی میسر و دەوڵەتانی تری ئیسلامی نەیان ئەزانی، بەڵکو باسکردن و ناوبردنیشی بقە بوو، بقەیەك زانایانی ئایینیش سڵیان لێ ئەکردەوە، چونکە هەزاران ناووناتۆرەی بۆ دروست ئەکرا و هەزاران گێزوگوڵنگی خیانەت و جاسوسی و هتدیان بۆ ئەهۆنرایەوە، جارجاریش دواکەوتووی نەگونجاوی ئیسلام و پێشێلکردنی ماق ئافرەت لە ئیسلامدا و کۆنەپەرستی ئیسلام. لە جێی ئەمانە هەمووی، یاسایەکی ڕێك‌وپێك و پێشکەوتووخوازی (بە خەیاڵی خۆیان) ئەوروپایان پێ ئەوتن. بە کورتی لە ڕۆڵەی مووسوڵمانەکان نەوەیەکیان دروست کرد خۆی کوێر و کەڕ و لاڵ بێ و بە چاوی ئەوروپا ببینێ و بەگوێی

ئـەوروپا ببیسـتێ و بـە زمـان و شـێوە و چـۆنێتی بیرکردنـەوەی ئـەوان بـدوێ. لـە ڕاسـتیدا نەخشـەیەکی دوژمنانـەی ژەهـراوی سەرکەوتوو بوو، ئەمە نەک تەنیا لە میسر، بەڵکو لە هـەموو وڵاتـە ئیسـلامییەکانی تریش بەم نەخشـەیە هەڵسان و سەریشکەوتن، بۆیـە ئـەبینین کۆمـەڵێکی ڕۆڵـە ڕۆشـنبیرەکانمان پـەروەردە و پاڵفتـەی ئـەو نەخشـەیەن، بـێ ئـەوەی خۆیـان بـە خۆیـان بـزانن، هەرچەندە ئەم وڵاتـە ئیسـلامییانە توانییـان بە ڕواڵـەت خۆیـان لەژێر چەپۆکی ئەوروپاییە ئیمپریالیزمەکاندا ڕزگار بکەن، بەڵام لە ڕاسـتییدا خۆشیان هـەر ئەو ڕامیارییە زانیارییـەی ئـەو بـۆی دانـاون، لـە سـەری ئـەڕۆن، ئەمـە بـوو بـەکورتی هەڵوێسـتی کافرەکـانی ڕۆژئـاوا بەرامبـەر بـە بیروبـاوەڕی ئیسـلام، هەڵویستێکی ژەهراوی وەکو کورد ئەڵێ: دوژمنێکی نەرمە برە.

## كوفری سوور و قۆناغەكانی :

وا ئێستا دێینە سەر هەڵوێستی كافرەكانی ڕۆژهەڵات بەرامبەر بە ئیسلام و گەلانی مووسوڵمان، جا وەكو بۆ نموونە (كوفری سوور)، كوفری ڕۆژئاوا و وڵاتە ئیسلامییەكان، ئینگلز و میصرمان هێنایەوە، هەروەها بۆ نموونەی وڵاتە ئیسلامییەكان بەرامبەر بە هەڵوێستی كوفری ڕۆژهەڵات و ماركسایەتی، موسڵمانەكانی ڕوسیا ئەهێنینەوە لە یەكێتی شورەوی (ڕوسی) پتر لە (٣٠) سی ملیۆن مووسوڵمانی تێدا ئەژی، ڕێژەی موسڵمانەكان لە چاو دانیشتوانی وڵاتەكەیدا بریتییە لە ١٥٪ وڵاتانی قەوقاز و ازبكستان و ئازەربایجان و تابستان و توركمانستان و كازاخستان، بەسەروبەریانەوە وڵاتی ئیسلامین و خاوەنی زێڕینترین مێژووی ڕۆشنبیری ئیسلامی بون، كەڵە پیاوانی زانیاری . تەفسیر و حەدیث . ن، ئەم وڵاتانە دەوڵەمەندترین وڵاتەكانی تری ڕوسیان و كانی (ئاسن و مس و یۆرانیۆم ) یان تێدا هەیە، جا كاتێك شۆڕشی . بەڵشەفی . لە ژێر سەركردایەتی بیروباوەڕی ماركسایەتیدا ڕووی دا، مووسوڵمانەكانی ڕوسیای شیوعی بەم سێ قۆناغەدا تێپەڕیون:

قۆناغی یەكەم: چەوساندنەوە و لێدان.. كاتێك لە ساڵی ١٩١٧ دا شۆڕشی ئۆكتۆبەری بەلشەفی سەركەوت و سەركردەكانی ڕوس

جێگیر بـون، مووسـوڵمانەکان بەربەرەکانێیـەکی زۆریـان کـرد بـۆ ئەوەی مل بۆ مارکسییەکان شۆڕ نەکەن. تەنانـەت دەسـتیان دایـە چەك و لـە ناوچەکانی قـەوقاز و تـەتاردا پێشمەرگەیان دروسـت کـــرد و بەریـــەرەکانێی چـــەکداری ســـەرکردەکانی و ڕژێمـــی مارکسایەتیان کرد، ئەویش لەبەر ....

١. بیروباوەڕی مارکسایەتی بیرەوەرییـەکی (ملحـدە)و بیرەوەرییـە کـە هـیچ بـاوەڕی نییـە بـە خـوای گیـان و نادیـار غـەیب و ڕۆژی پاداشت (قیامەت)، لە بیرەوەری مارکسایەتیدا مـاددە سـەروبەری ژیانە و چۆنێتی پەرەپێدانی و لێشاو کردنی بەرهەم، پەیوەنـدی نێوان تاك و کۆمـەڵ دیاری ئەکات، لەگـەڵ پەیوەنـدی نێـوان تـاك تاکیشـدا، بـەڵام بـە پێچەوانەی بیرەوەری ئیسـلامی، کـە ئیسـلام بیروباوەڕێکـە لەسـەر بنچینەی بـاوەڕ بـە خـوا و لێپرسـینەوەی ڕۆژی پاداشـت دانـراوە. پەیوەنـدی نێـوان تـاك و کۆمـەڵ، تـاك لەگەڵ تاك و کۆمەڵ لەگەڵ کۆمەڵ، دیاری ئەکات. لێرەدا زۆر بـە ڕوونـی دیـار نییـە ئـەم گێـرەو کێشـەیەی تووشـی کۆمـەڵی مووســـوڵمانان نـــابێ، چـــونکە ئـــەو تاکـــە مارکســـییەی کـــە دیکتـــاتۆرێتی پرۆلیتـــاری بووەتـــە خـــوای و ترســـی ئـــەو و سـیخوڕەکانی نـەبێ هـیچ شـتێکی تـر نییـە لـە خراپـەکردن بیگەڕێنێتـەوە، دیارە هـەرکاتێك پەنایـەکی بۆ ڕێکـەوت، چی بۆ

دەست بدات کۆی لێ ناکاتەوە، بەڵام مووسوڵمان وا نییە، چونکە (ئیمـان) جڵـەوێتی و چەندە بتـوانێ خۆی لـە یاسا بشارێتەوە ناتوانێ خۆی لە ڕقەبەری خوایی خۆی بشارێتەوە.

٢. ئامانجی مارکسایەتی بریتییە لە نەهێشتنی ماڵداری خۆیی (الملكيـه الفرديـه) بۆ ئـەوەی ماڵـداری گشـتی (الملكيـه العامـه) جێگـای پڕ بکاتـەوە، چونکە لـە یاسـای مارکسـایەتیدا ماڵـداری گشـتی ئامانجـه و ماڵـداری خۆیی شـتێکی زۆڵـه، کـه وەکـو لـه یاسای سەرمایەداریدا ماڵداری خۆیی ئامانجه و ماڵداری گشتی و دەوڵـەت لاپـواز و زۆڵـەکن، بـەڵکو هـەردوو ماڵدارییەکـه بـه هـەردوو شـێوەکەی ئامانجـەو بونیـان پێویسـتە، نـابێ هـیچ جۆرێکمان بسڕێتەوە.

٣. بـیرەوەری مارکسـایەتی لەسـەر بنچـینەکانی . زۆرانبـازی چینایەتی (الصراع الطبقی) دانراوەو هەموو چینەکانی لەگەڵ ئەکاتە دژی یەکتری و دوای گەورەترین چین که چینی کرێکارە، هەڵئەبژێرێ، بەڵام ئیسلام ددان بە زۆرانبازی چینایەتیدا نانێت، بـەڵکو ئەوپـەڕی یارمـەتی لـە نێـوان هـەموو چـینەکانی گەلـدا دروست ئەکات و برایەتییەکی پتەو لە نێوان هەموو تاکەکانی کۆمەڵـدا ئەچەسـپێنێ، ئـەم سـێ خاڵـه دژایەتییـه بونـه هـۆی جیاوازییـەکی گـەلێ دووری بـیرەوەری نێـوان موسـڵمانەکان و

سـەرۆکە شیوعییەکانی ڕوسیا، لەبەر ئەمە هـەتا ئەهات کڵپـەی شۆڕشـەکەیان ڕۆژ بـە ڕۆژ بـەرزتر ئـەبووەوە و پـەل‌وپۆی لـە دەوڵـەتی ڕوسیا لـەو ناوچانە بڕیبـوو، هـەر چـەندە ئـەو سـزا و چەرمەسەرییەی مێژوو بە خۆیەوە نەدی بوو، لە موسڵمانەکاندا تاقیکرایەوە، بە هـەزاران لاو هەڵواسـراون و بە هـەزاران مزگـەوت کرانە گـەوڕی وڵاخ (ئاژەڵ)، بە هـەزاران زانـای ئاینی خزانـە نـاو فڕن و سوتێنران، وا نموونەی کوشتنی یەکێك لە هەرە زاناکانی ئیسلام ئەخەینە بەردەست. (مشتێك نموونـەی خەروارێکـە)، لەم کاتی شۆڕشەدا لە توورکستانی مووسوڵمان، یەکێك لە زانا هـەرە بەرزەکانی موسڵمانەکانیان هێناو چاڵێکی قووڵیان بۆ هەڵکەندو پاسـەوانیان بـە دیـارەوە دانـا، ئـەمجا فـەرمان دەرچـوو بـۆ دانیشتوانی شارەکە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك ئەبێ پیسایی خۆیان بهێنن و فڕێی بدەن بەسەر ئەو زانایەدا، لەو چاڵەدا کە پڕ بوو لە پیسایی ئادەمیزاد و زاناکە شـەهید کراو چاڵەکەش بوو بە گۆڕی[٥٨].

بـەڵام شۆڕشـی مووسـوڵمانەکان هـەتا ئـەهات زۆر تـر دۆخـی فیـداکاری و قوربـانی وەرئـەگرت و لەشـکری ڕوسـیایان شـپرزە کرد بوو، سەرۆکەکانی مارکسایەتی بۆیان دەرکەوت هـەتا ئـەمان

---

[٥٨]. فی ظلال القران . جزء الرابع . ص ١٥٣، ١٥٤ الطبعة السابقة.

دژی ئـاین بـن و لـه واقعـی ئـاین کـه واقعـی هـەموو گـرۆی ئادەمیزادانه ڕابکەن زیاتر خەڵکیان لێ ئەهروژێ و نەك تەنیا لە ڕوسیا، بەڵکو لە هیچ ولاتێکی تری ئیسلامیدا جێگایان نابێتەوە و شۆڕشـی مووسـوڵمانەکانی . قـەوقاز و تـەتاریش . سـەریان ئەخوات، لەبەر ئەوە قۆناغی دووەم هاتە پێشەوە ٥٩.

قۆنـاغی دووەم: کـاتێ ئـەم ترسـه وەکو مێردەزمە سواری شـانی هـەموو سـەرۆکەکانی مارکسـایەتی بـوو ئـەمجا دەسـتیان لـه چەوساندنەوەو کوشتار هەڵگرت و دەستیان کردە ماستاو کردن بۆ موسڵمانەکان و ئیسلام، هێنایـان ئـەو دادگەرییە کۆمەڵایـەتی یـه ڕاسـتەقینەی ئیسـلام پـێش (١٣٥٠) سالّ لەوەوبـەر دیـاری کردبوو، مارکسایەتیش خۆی پـێ ڕەنـگ کردو کردیانـه نوقتـەی بەیـەك گەیشـتن بـه زانـا مووسـوڵمانەکان و بـه لاوە ڕۆشـنبیرە مووسـوڵمانەکانیان ئـەوت ئەگـەر ئێـوە شـوێنی قورئـانی پـیرۆز کـەوتوون، ئـەوە نییـه قورئـانی پـیرۆز دژی ئاغـا و بـەگ و چەوسـاندنەوەی جوتیـار و هـەموو جـۆرە سـتەمێك وەسـتاوە، ئێمەش هەر داوای ئەوە ئەکەین . قورئانی پیرۆز دژی سو (ربا) و هـەموو کـۆتێکی تـری ئابوورییـه، ئێمـەش داوای ئـەوە ئەکـەین.

---

[59]. بجلة ( العربى) الكويتى / عدد ١٨٠ / سنة ٩٧٣ ص٤٧

قورئـانی پـیرۆز داوای مسـۆگەرکردنی ژیـان ئـەکات بـۆ هـەموو ئەندامەکانی کۆمەڵ، ئێمەش داوای ئەوە ئەکەین .... هتد.
لەم جۆرە پیازانەیان پاك ئەکرد.

کلکـە لەقـەی مارکسـییەکان بـۆ ئیسـلام بەمەیشـەوە نەوەسـتا هـەر پیـاوانی کـرملین خۆیـان داوایـان کـرد کـە رامیارییـەکی سەربەخۆ دروست بکەن بۆ مووسوڵمانەکانی روسیا، لەبەر ئەمە پـەنایان بـردە بـەر چـەند پیـاوانی رۆشـنبیرو زانایـانی ئـاینی ناوچـەکە. لـە ئەنجامـدا دوو پیـاوی بلیمـەتیان لـە موسـڵمانەکان هەڵبـژاردو پـارتێکی تازەیـان بـە نـاوێکی سـەیرەوە بـۆ دروسـت کـردن دوو پیاوەکـە سـوڵتان گـالیف Lesultan Galieve و حەنەفی موزمیر. حنفی مظهر. بون، بۆ هەڵسان پـارتی ئیسـلامی کۆمۆنیسـت. Lepart communiste musulman یـان دروست کرد. الحزب الشیوعی الاسـلامی. و بنـاغەی پارتەکـەیان لەسەر ئەو چەند خاڵانەی کە مـارکس و ئیسـلام یـەك ئەگرنـەوە، رێکخســت، بـەو شـێوەیە لـە قۆنـاغی دووەمـدا هـەموو جـۆرە رواڵـەتێکی بڵاوکردنـەوەی (ئیلحـاد) بـە ئاشـکرایی لـە وڵاتـە مووسـوڵمانەکانی روسـدا قەدەغـە کـرا . دیالـەکتێك لـە بـەرگی دیاریـدا شـارایەوە بـۆ ئـەوەی لـە بـەرگی (پـەروەردەدا) بێتـە

مەیدانــەوە، هەرچــەندە دروســتکردنی (پــارتی کۆمۆنیســتی ئیسلامی)٦٠

بۆ خزمەتکردنی مووسوڵمانەکان نەبوو، بەڵکو پارتێکی کارتۆنی بــوو بــۆ ئــەوەی ببێتــە شەقشــەقەی دەســتی منــاڵ و پیــاوانی مووســوڵمانی ڕوســی پــێ دابمــرکێنن، بــەڵام بــە زیرەکــی لاوانــی ئیســلامخواز و بلیمــەتیی زانایــانی ئــایینی ڕوســیا، ئــەم کەلێنــە بووە کونا وەجەیەك و دەرگـای ڕۆشـنبیری ئیسـلامیان لەبەردەم زۆر لــە نووســەران و پیــاوانی بیریــاری مارکســایەتی دا کــردەوە، زۆرێك لە ڕاستییە شـاراوەکانی ئیسـلامیان بۆ دەرکـەت، ئـەوەتا . ڕۆجیـە گـارودی . فەیلەسـوفی گـونجـانی مارکسـایەتی سـەدەی بیســــت، لــــە کتێبــــی (البــــدیل ص١٤)دا بەرانبــــەر ئیســــلام و بیروباوەڕی ئیسلام ئەڵێ:

بـەو شـێوە واتـە ئیسـلام هـەرگیز بـەنگ و تریـاك نییـە، بـەڵکو هـەوێنی گـۆڕینی بیروبـاوەڕێکی ڕواڵـەتی هـەموو جیهانـەوە هـەر لێدانێك بدریّ لەو بیروبـاوەڕە، لێدانـە لـە شۆڕشـێکی ڕاسـتەقینە . یان لە گۆڤاری . افاق عربیە . ی عێراق، ژمارە (١٠)دا ئەڵێ:

---

٦٠. د . محمد شوقی فخری لە گۆڤاری . العرب . ژمارە / ١٨٠ ساڵی ١٩٧٣ دا وتارێکی جوانی لە ژێر ناونیشانی (المفاهیم المارکسیة یطورها الفکر الاسلامی) بلاوکردەوە و بە وردی ئەم باسەی نووسیبوو.

بیروباوەڕی ئیسلام مێشکی هەموو نەوەی سەردەمی گرتۆتـەوە کە ئەمەیش خاڵێکی گەلێ گرنگە و پێویستە زیاتر تیشکی لـە سەر چڕ بکرێت[٦١].

لـە ساڵی ١٩٦٨ دا زنجیرە وتارێکی لـە گۆڤاری . الطلعیة . میسری دا بڵاوکردەوە و تێدا وتبوی: ئـاینی ئیسـلام وەکـو ئاینێکی تر نییە. ئاینی ئیسلام جەو جولێ تێکۆشان و شۆڕشە، ئـاینی ئیسـلام ئـەو ئاینەیـە مووسـوڵمانەکانی فێرکـرد چـۆن ئیمپریالیزم لـە وڵاتەکەیان دەربکەن. ئاینی ئیسلام هیچ کاتێك دارێك نـەبووە بـە دەست ستەمکارانەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئـامێری شۆڕشی چینی چەوساوە بووە بۆ ڕووخاندنی قـەڵای ستەمکاران. گارودی لە سەر مەسەلەکە ئەڕوات و ئەڵێ...

کاتێك مارکس ئەو تیۆرانەی داناوە، ئەو هەڵوێستە چەوتانەی بووە بەرانبەر بە ئاین. شارەزایی لە ئاینی ئیسلام و مێژوو و بیروبـاوەڕی ئاینەکـەدا نـەبوو، خـۆ ئەگـەر شـارەزایی پەیـدا بکردایـە، ڕاکـانی هـەموو ئـەگۆڕی، چـونکە مـارکس تـەنیا لـە گۆشـەی ئـاین لـە ئـەورووپادا و هەڵوێسـتی کەنیسـەوە سـەیری هەموو ئاینێکی کردووە[٦٢].

---

[٦١]. من الكفر الى الايمان . جواد خالص . ص٢٢

[٦٢]. حركة الاسلام و مفكر الغرب . د . عبد الحميد . ص٨

بەم شێوەیە ئەم قۆناغی دووهەمەی مووسوڵمانەکانی ڕوسیا بووە هۆی وتوویـژ لـە نێوان مارکسایەتی و ئیسلامدا و پیاهەڵدانی سەرۆکەکانی مارکسایەتی بە ئیسلامدا.

قۆناغی سێیەم: پێش ئەوەی بچینە سەر باسکردنی هەڵوێستی مارکسایەتی بەرانبەر ئیسلام و گەلانی موسڵمان لە قۆناغی سێهەمدا، ئەمەویٚ ڕای بگەیەنم کە من باسی مارکسایەتی بەگشتی و گەلانی مووسوڵمان بە گشتی باس ئەکەم، ئەگینا چاوم لە مارکسایەتییە چۆن باڵی ڕەشی بەسەر دڵ و دەروونی هەندێکی زۆر لە لاوەکانماندا کێشاوە و زۆربەی زۆری نووسەرەکانمان مارکسایەتییان کردۆتە . مۆدیل . و کردوویانەتە مۆری نێو چاویان، بیٚ ئاگایە لە جیهانی بیروباوەڕ و بیٚ ئاگایە لە هەرەسی مارکسایەتی، ئەگینا چاوم لەو لاوانەیە شەو ڕۆژ ئەکەنەوە بە دیار پەڕەو کتێبە نووسراو و بڵاوکراوە ئاشکرا و نەهێنییەکانی مارکسایەتییەوە، ئەزانم چۆن جیهانێکی میثالی و ئایدیالی مارکسایەتییان بۆ خۆیان تاشیوەو هەریەکەیان پایتەختێك لە پایتەختەکانی دەوڵەتە کۆمۆنیستەکانیان کردۆتە ڕووگە و وەکو قیبلەنما ڕووی دڵیان تیٚ کردووە. ئەگینا چاوم لەوەیە گۆڤار و ڕۆژنامە و کۆڕە ئەدەبی و ..... هتد

کانمان چۆن زۆربەی زۆری بە هـەوێنی مارکسایەتی گیرساون، تەنانەت چاوم لە نووسینی مێژووی ئەمرۆی کوردە و ئەزانم لـەژێر تیشکی ماددیـەتی . ماتریـالیزمی مێـژووی . المادیـە التاریخیە) دا ئەنووسری٦٣.

بەڵام من وەکو مووسوڵمانێکی کورد سەیری جیهانی گەورەم . جیهانی ئیسلامی . ئەکەم و چاویشم لە هەرەسی مارکسایەتییە. جا ئێستا دێینە سەر باسەکەمان و قۆناغی سێهەمی کوفری سوور.

١. لە ڕوسیادا سوڵتان گالیف و قوتابییەکانی بە ناوی پارتـە کارتۆنییەکەیانەوە بڵاویان کردەوە کە:

أ. سوڵتان گالیف یەخەی خۆی هەڵئەتەکێنیٚ لە ماددیەت و مەرج نییـە سۆشیالیستی لەسـەر بنچینەی ماددیـەت دابنرێت، هەیـە سۆشیالیستییە و مادی نییـە، کەچی هەیە ماددییە و باوەڕی نییـــە بـــە بـــونی خـــوایش و کەچـــی هـــەڵگری بیروبـــاوەڕی سۆشیالیستی نییـە و سـوڵتان گـالیف ڕایگەیانـد کـە ئـاینی پیرۆزی ئیسلام نزیکترین بیرەوەرییە لە سۆشیالیستیەوە، چونکە

---

[63]. وەکو کتێبی کوردستان و کورد / نوسینی د. عبدالرحمان قاسم لو (خوا بی بەخشیٚ )

هەردووکیان بریتین لە نەهێشتنی ستەمکاری و چەوساندنەوە و هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوان سۆشیالیستی و ماددیەتدا.[٦٤]

ب. سـوڵتان گـالف ڕایگەیانـد کـە مـەرج نییـە بـۆ چەسـپاندنی سۆشیالسـتی هـەموو ڕواڵـەتێکی ماڵـداری خـۆیی تـەفروتونا بکرێت، بەڵکو بە هەر کۆمەڵگایەك چۆن لەگەڵ چۆنێتی جێبەجێ کردنیـدا ئـەگونجێ، بگونجـێ. ئەمـەیش لـە کـۆنگرەی پـارتی کۆمۆنیستی ساڵی ١٩٥٦مارکسایەتی قیـژەی لێ هەڵسا و داوای خۆسازاندنی کرد لەگەڵ هەموو ڕێبازەکانی تردا، ئا بەو شێوەیە ئـەبینین لـە قۆنـاغی سـێهەمدا سمارتـە لـە کاکڵـەی بیروبـاوەڕی دراوە، نـەك لـە دەوڵـەتێکی ڕۆژئـاوایی سـەرمایەداریدا، بەڵکو لـە لانـە و نیشـتمانی مارکسـایەتیدا خـۆی، ڕوسـی ئـەوسـا و کـاتی مارکسایەتی.

٢. خــۆ لــە وڵاتــە مووســوڵمانەکاندا بەمەیشــەوە نەوەســتا، مارکسـایەتی زۆربـاش زانیـوێتی و ئـەزانێ هـەر بیروباوەڕێـك لـە وڵاتە ئیسلامییەکاندا دژی ئایین بووەستێ، مانای ئەوەیە خۆی بەدەستی خۆی گۆڕ بۆ خۆی هەڵئەکەنێ.[٦٥]

---

[٦٤]. مجلة العرب الکویتی العدد ١٨٠ تشرینی الثانی ١٩٧٣.

[٦٥] ڕۆژی ١٥ــ٢ــ ١٩٧٩پـارتی کۆمۆنیسـتی (تـوودە)ی ئێـران بەیاننامەیـەکی بڵاوکـردەوە و پشـتگیری لـە بـەرپاکردنی کۆمـارێکی ئیسـلامی پیشـانداو بـەڵێ حیزبی توودە . داوای کۆماری ئیسلامی ئەکات.

لەبەر ئەوە لەم قۆناغەیدا لە چەند قۆڵێکەوە و لەلایەن چەند زۆڵێکەوە بەرگی مووسوڵمانەتی کردە بەری و ڕێوی ئاسایی ڕیش و پرچ و تەسبیحی گرت بەدەستەوە و هاتە سەر شانۆی خۆدەرخستن، بۆ نموونە:

١. عەسرێك لە کتێبخانەی ـ بێکەس ـ لە سلێمانی بووم، ژمارەیەکی گۆڤاری ـ روز الیوسف ـ م بەرچاوکەوت و وتارێکی زۆر سەیرم بە پێنووسی (خالد محی الدین) کەڵە نووسەری مارکسیەکانی میسر و هەڵگری خەڵاتی (لینین) لە شتی دابوو، گۆڤارەکەم کڕی و هاتمەوە بۆماڵەوە، ئەوکاتە ماڵمان لە سلێمانی بوو، سوێندی کەسم لەسەر نییە بە شێوەیەك پێکەنین گرتبوومی، خۆم پێ نەگیرا، بەتایبەتی کە نووسیبووی ( وما المانع من ان یکون الواحد منا مارکسیا ومسلما فی ذات الوقت؟ وما المانع من أن نضیف الی المارکسیة بعداء حیا؟ هتد)

واتە قەیدی چییە ئەگەر هەریەکەمان مارکسی بین و مووسوڵمان بین لە هەمان کاتدا ؟

قەیدی چییە ئەگەر بوارێکی گیانی بخەینە سەر مارکسایەتی؟ ئیتر خالید و هاوزوڕناژەنانی وەکو خالید لە یادیان چووە کە ئەم پێشنیارە دڵسۆزانە ـ یان مۆدەی تەواوبوو لە لایەکەوە و لە لایەکی ترەوە درۆیەکی زلە بەدەم مارکسی ئەوان و پێغەمبەری

ئێمەیشـەوە، مارکسـێك کـە بـاوەڕی بـە گیـان و خـوا و ڕۆژی زیندووبونەوە نەبووە، چۆن خالید و هاوڕێیانی خالید ئەتوانن (بوعدێکی ڕۆحی) بدەنێ، یان ئیسلام چۆن ڕازی ئەبێ لە خوێنی پیرۆز و بـەتینی خـۆی بکاتـە لاشـەی مـردووی بیروباوەڕەکـەی مارکسییەوە.

ب. لـە ولاتـە مارکسـییەکان دەسـتیان کـردە پاکانـەکردن و کڕوزانـەوە بـۆ مووسـوڵمانەکان بـۆ یەکـەمجار مووسـوڵمانەکانی چین، ئەمسـاڵ سـاڵی ١٩٨٧، جـەژنی قوربانیـان بـە ئاشـکرا کـردووە. ڕوسـیا کتێبـی ( الاسـلام و المسـلمون فـی الإتحـاد السـوفتی) بـە هـەزاران دانـەی چاپ کـردو بـە خـۆڕایی بـڵاوی کردەوە.٦٦

وە نـەبێ مارکسـییەکان ئـەم ماسـتاوە تـەنیا بـۆ موسـوڵمانەکان بکـەن، ئـەوەتا لـە ئـەوروپادا بـەرگێکی گاوریـان کردۆتـە بـەرو بـەناوی (پـارتی سۆشیالسـتی مەسـیحی)یەوە ئـەدوێن، (بـەڵێ

---

٦٦. نامەوێ ئەو کلکە لەقانەی هێلکە مارکسییەکی خۆمان و پاکانە کردن بۆ بزووتنەوەی هارچەرخی ئیسلامی ئەیکەن، بیانهێنم و بیان نووسم، بەڵام فەرموو بڕۆ سەیری گۆڤاری ـ روز الیوسف ـ و زمانی هێلکە مارکسییەکانی میسر بکە و بزانە د. فواد زەکەریا لە ژمارە (٥١٢) ڕۆژی ٢/٨/ ١٩٨٦ دا چۆن پاکانەیەك ئەکات، خۆ ئەگەر گۆڤارەکەت دەست نەکەوت ئەوا کتێبی مرۆڤ و دەورووبەری مامۆستا مەسعود محەمەد، بەرگی یەکەم، لاپەڕەی (٢٥ ـ ٣٢) ی بخوێنەرەوە.

سۆشیالستی زانیاری به بهرگی كهنیسهوهو ههر له ئهورووپاشدا) خـۆی ئـهنوێنیٚ. بـهلاّم ئێمـهی مووسـوڵمان گوێمـان لـه قورئـانی پیرۆزه ئهفهرمویٚ:

{ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ } (التوبه ٨).

ئهمـه بـوو ههڵوێسـتی كـوفر بـه هـهردوو بهرهكهیـهوه، شـهرق و غهرب، بهرانبهر به ئیسلام و گهلانی مووسوڵمان.

## ڕواڵەتی سێیەم / ( یاسا ـ النظام ):

ئەگەر لاپەڕەی کۆن و نوێ و ڕابردوو و ئێستای هەر ئاینێك لە ئاینە زیندووەکان و ئاینە لە ناوچووەکان ئەم دیوو ئەو دیوو بکەین، بە زەرەبینی بیرکاری و شیتەڵکردنەوە، جگە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام سەیر ئەکەین، بە دوور و نزیك قەرەی یاسا و ڕژێم نەکەوتوون، لێرەدا لەبەر کەمی ماوە ناتوانین بێدەنگییان لە ڕووی کاربەدەستاندا باس بکەین، ئەوەتا دوا چوڕی هەموو ئاینەکان (جگە لە ئیسلام) و ئاینی ڕەسمی ئەوروپا کە ئاینی مەسیحیە، کە ئەفەرمووێ (ما لله لله ءما لقیصر لقیصر)

واتە: ئەوەی پەیوەندی بە خوا و ئاینەوە هەیە ئەوە هی خوایە و کەس مافی دەسدرێژی بۆ کردنی نییەو ئەوەیشی کە هی قەیسەرە . پادشا و دەوڵەت . ە خوا و ئاین پەیوەندییان پێوەی نییە و مافی دەستکاری کردنیان نییە، کەواتە جگە لە ئیسلام هیچ ئاینێك دەستکاری کاربەدەستان ناکات (بۆیە لێزمەی سەرکوت کردنەوەی لە لایەن کاربەدەستانەوە لە هەموو چەرخ و شوێنێکدا تەنیا بۆ سەر ئسلامەو ڕوو ناکاتە هیچ ئاینێکی تر) ئاینی ئەوروپا دەستەڵات و ڕژێم دەکات بە دوو بەشەوە، دەستەڵات و حوکمدارێتی زەوی و دەستەڵات و حوکمداریەتی ئاسمان. ئاسمان بۆ خوا و زەوی بۆ کاربەدەستان، کە مرۆڤە.

خوا بۆی نییـه دەسـتكاری یاسـا و ڕژێمـی كاربەدەسـتانی زەوی بكـات. كەواتـه هــەموو شارسـتانییەتی ماددیـەت بـه هـەردوو سـەربازگەكەیەوە، خـاوەنی هـیچ ڕژێمێكـی ئـاینی نییـه و تـەنیا یاسا دەست هەڵبەستەكان (القوانين الوضعية) ڕژێمیانه .

پێش ئەوەی بێینه سەر هەڵسەنگاندنی یاساكانی ئیسلام و باس كردنیـان و بـەراوردكردنیان لەگـەڵ یاسـاكانی شارسـتانییەتی ماددیـەت، چـەند جیاوازییـەكی بنـەڕەتی لـه نێـوان یاسـاكانی ئیسلام و یاساكانی تردا هەیه، پێویسته باسیان بكەین.

١. یاساكانی ئیسلام یەك پارچەیەو هەرگیز نابێ پارچەی لێ جیا بكرێتــەوە و بدرێتــه دەم یاسـایەكی تــر، یـان پارچـەیەك لــه یاسـایەكی تـری بـۆ بهێنـرێ و بدرێتـه دەمـی و نـاواخن بكرێـت، ئەویش لەبەر ئەوەیـه هـیچ كێشـەیەكی ژیـانی هـیچ مرۆڤێك نییـه لـەم سـەرزەوییەدا كـه شـەریعەتی ئیسـلام و یاسـاكانی ئیسـلام چارەسـەری نـەكردبێ و جـوانترین و شـیاوترین چارەسـەری بـۆ دانـەنابێت، هــەر لـه یاسـای ڕمیـاری و ئـابووری و یاسـاكانی ئاشتی و ڕۆژگارانی جەنگ و نەخشەی جەنگ، هەتا پەیوەنـدیی مووسـوڵمان لەگـەڵ خـۆی و دەوروبـەری و هاونیشـتمانەكانی و هـەموو دانیشـتوانی سـەر زەوی، بـه كـورتی، هـیچ گۆشـەیەكی

ژيانی ئادەميزاد نييه كه ياسای ئيسلام تيشكی زێرينی بۆ چڕ نەكردبێ و كون و كەلەبەرەكانی بۆ مرۆڤ ڕۆشن نەكردبێتەوە.[٦٧]

٢. ئامانجی ياساكانی ئيسلام پاراستنی مافی كۆمەڵە زياتر له مافی تاك، بەڵام تاكيش پێشێل ناكات، هەر كاتێ بەرژەوەندی تاك بوو بە كۆسپ لەڕێی بەديهێنانی ئامانجی گشتی كۆمەڵدا ـ بەبێ بەزەيی ياساكانی ـ ئيسلام سەركوتی ئەكات، چونكه له ياسای ئيسلامدا دارايی و دەسەڵات تاپۆی كەس نييه، بەڵكو هی خوايه، داوێتی بە كۆمەڵی ئادەميزادان كاتێ ئەندامێك يان كۆمەڵێك له كۆمەڵگای مرۆڤايەتی لە بەرەی خۆيان پێيان زياتر ڕاكێشا، ئەوە ياسای ئيسلام پێيان ئەبڕێتەوە.[٦٨]

٣. ياساكانی ئاينی ئيسلام وەكو هيچ ياسايەكی تری ئايين و دەست هەڵبەست ـ وضعی ـ نين، چونكه لە ئيسلامدا هەموو بەندێكی ياسەكە چەندە هەوێنی ئاينی تێدايە، ئەوەندەش هەوێنی ماددی تێدايه، چەندە سەنگ خراوەتە سەر ياسای ڕژێم، ئەوەندەش چاوزەقكردنەوەی سزايی خوايی، دۆزەخی لە پاڵدايە، لەبەر ئەوە جێبەجێ كردنی هەر ياسايەك لە ياساكانی

---

[٦٧]. نظرية الاسلام و هدية و القانون و الدستور / ابو الاعلى مودودى ص ١٩٨

[٦٨]. الاسلام بين جهل ابنائة ء عجز علماء / شهيد القادر .

ئیسـلام وهکـو پشـوودان و دڵنیـایی دهروونـی تێدایـه، هـهروهها چاوهڕێی پاداشتی پاشهڕۆژیشی لهگهڵدا ئهکات .[٦٩]

٤. یاسـاکانی ئیسـلام یاسـایهکی جیهـانین و بـۆ هـهموو چین و کۆمـهڵ و هـۆز و کۆزێـك هـاتوون، بـه یـهك چـاو سـهیری هـهموو ئهندامـهکانی مرۆڤایـهتی ئـهکات، تهنانـهت لـه ڕووی یاسـای ئیسلامدا هیچ جیاوازییهك نییه له نێوان موسڵمان و کافردا، ( لهم ما لنا و علیهم ما علینا ).

٥. گـرنگترین جیـاوازی یاسـاکان ( یـان شـهریعهتی) ئیسـلام و لهگـهڵ یاسـاکانی تـردا، ئهوهیـه کـه ئـهم یاسـا ئیسـلامییانه (خــوایی)ن، لـــهو سهرچـاوه خوایـــهوهن و بـــهرهو لای خـــوا ئهگهڕێنـهوه، مهبهسـتمان لـه سهرچـاوهی خـوایی ئهوهیـه کـه چوارچـێوهی یاسـاکانی ئیسـلام (خـوا) خـۆی بـهو هـــهموو ئاگادارییـــهی لـــه ئـــادهمیزادوو ڕازهکـــانی ئـــادهمیزاد وهکـــو دروستکراوێکی، دایڕشتوون، بهڵام ههموو یاساکانی تـر بێجگه له ـ ئیسلام ـ وهکو خاوهنهکانی ـ مرۆڤ ـ، ئهگهر له ڕووێکهوه سـهرکهوتوو بـێ، لـه چـهند ڕووێکـهوه پهسـته و هـهزاران پاڵهپهسـتۆی ئارهزووکـاری، یـان ڕهگهزپهرسـتی یـان نـهتوانین، سواری بووه، یان کارتێکردنی شوێن و کات و دۆخی ڕۆشنبیری

---

[٦٩]. الاسلام بین جهل ابنائه ء عجز علماء / شهید عبدالقادر.

ئەو مرۆڤە (یان ئەو مرۆڤانە) هەزاران کون و کەلەبەری کردۆتە یاساکانیان.[٧٠]

مەبستمان لە گەڕانەوەی یاساکان بۆ لای خوا، واتە بناغەی یاساکانی ئیسلام لەسەر بنچینەی پەیوەندی نێوان ـ خوا و مرۆڤ ـ دانراون، لەبەر ئەوە باوەڕی هەر شوێنکەوتوویەکی ئەو یاسایە، وەکو پۆلیسێکی ئاسایش چاودێریکەرێکی خاوەن باوەڕەکە ئەبێ.

٦ یاساکانی ئیسلام تاقە یاسایە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتی کە ڕەگەزی ـ نەگۆڕاوی ـ وەك ڕەگەزی (عنصر الشباب و المرونة) ی تێدا هەبێ ... نەگۆڕاندن لە بنەڕەت و ئامانجدا ـ الأصل و الهدف ـ نەرمی لە چۆنێتی جێبەجێ کردن و لق و پۆپی یاساکاندا ـ (المرونة فی التنفیذ)، هەر لەبەر ئەم خاڵەیە یاساکانی ئیسلام بۆ هەموو گەل و ڕۆژ و شوێنێك دەست ئەدات، چونکە بە توخمە نەگۆڕاوەکەی هەرگیز ناتوێتەوە، هەرچەند دەور و ژیانی مرۆڤ بگۆڕێت، ئەوا چوارچێوەکەی و (بنەڕەت و ئامانجەکەی) وەکو خۆی ئەمێنێ، هەروەها بە توخمە

---

[٧٠]. شریعة الاسلام خلودها و صلاحها لكل زمان مكان د. یوسف قرضاوی / ص ١٨ عودة / ص٩

ئه‌رمییه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ دۆخی ژیانی هه‌موو ئاده‌میزادێكدا ئه‌گونجێ و له‌گه‌ڵ هه‌موو پێشكه‌وتنێكدا ئه‌سازێ.٧١

زۆر كـه‌س چ لـه‌ جاشـه‌كانی كـوفر و چ كـوفر خۆیـان، ئـه‌ڵێن له‌بـه‌ر ئـه‌وه‌ی كـه‌ ئـاین نـابێ ده‌سـتكاری بكرێـت، بـه‌پێی ژیـانی شارستانی ئه‌و مرۆڤانـه‌ بگۆڕێـت، له‌به‌ر ئـه‌وه‌ هـه‌موو ئاینێـك . ئیسلامیش . باوی نه‌ماوه‌ و تازه‌ یاسای كاتی قافڵه‌ وشتر و كه‌ر و بار له‌گه‌ڵ ژیانی ئه‌مڕۆی ئاده‌میزادی نێو ڕۆكێت و بن ده‌ریادا ئه‌گونجێ ...؟

ئێمه‌ش ئه‌ڵێن شه‌ریعه‌تی ئیسلام ئه‌بێت به‌ دوو به‌شه‌وه‌:

به‌شـی یه‌كـه‌م : ئـه‌و به‌نـده‌ یاسـاییانه‌ی كـه‌ لـه‌ ده‌قـی قورئـانی پیرۆزدا بـه‌ ڕووتـی هـاتوون و جێگـای شـیته‌ڵ و مانایه‌كی تـری نییـه‌، وه‌ك فـه‌رزبونی نوێـژ و ڕۆژوو و زه‌كـات و حـه‌ج كـردن و غه‌زاو قه‌ده‌غه‌بونی داوێن پیسی و سوود . (سو) . ڕبا . و عاره‌ق خواردنـه‌وه‌ و دانـانی به‌شـه‌كانی میراتـی و ئـه‌م یاسـانه‌ چـه‌نده‌ ڕه‌وڕه‌وه‌ی مێـژوو پـێش بكـه‌وێ، یـان دوابكـه‌وێ، هـه‌ر ئه‌مانـه‌ ده‌سكاری ناكرێن و وه‌كو خۆیان ئه‌مێننێته‌وه‌، هـه‌ر هـه‌وڵێ بـدرێ بۆ لابردنی، یان گۆڕاندنی ئه‌م به‌نـده‌ یاسایه‌نه‌یان، ئـه‌و كاتـه‌ بـێ مانـا ده‌رئه‌چـێت وه‌كـو ئـه‌وه‌ی بیانـه‌وێ لـه‌بری زه‌كـات (بـاج –

---

[٧١]. سه‌رچاوه‌ی پێشوو ل٢٢

ضـريبـه) دابنرێـت، نـابێ، يـان بـه نـاوى ڕابـواردن و گهشـتهوه عارهق خواردنهوه و شهڕوالْ پيسى حهلاڵ بكرێت، نابێ، يان به ناوى بهرههم زۆر كردنهوه ڕۆژ و نهمێڵرێت، يان دوا بخرێت له كاتى خۆيدا، نابێ.

بهشـى دووهــهم: زۆرتــرين بــوارى ياســاكانى ئيســلامييه كـه ماوهيهكى بهربڵاوى فراوانه بۆ ئيجتيهادى ژيريى مرۆڤ و دانانى نهخشه و ياسا بۆ خۆيان، له ناو چوارچێوهى چهند ياسايهكى نهگۆڕاو وهكو: زيان ئهبێ چارهسهر بكرێت و نهمێنێ، زيان لا نـابرێ بـه زيـان، زيـان ئـهدرێ لـه بهرژهوهنـديى تايبـهتى بـۆ بهرژهوهنـديى گشـتى و سـوودى كـهم بـۆ سـوودى گشـتى، وه پێويستيى قهدهغه حهلاڵ ئهكات ٧٢.

لهو ڕێسا (قاعده) زۆر فراوانهى كراونهته ڕێسا بۆ هـهتا هـهتايى، بهو پێيه ياساكانى ئاينى ئيسلام ياساى پێشكهوتن و ياساى بوارى ژيرى و مرۆڤايهتييه.

٧. له ياساكانى ئاينى ئيسلامدا هـهموو دانيشتوانى سهر زهوى به يـهك خێزان سـهير ئـهكرێت، بـهبێ گوێدانـه جياوازى نهتـهوه، يان ڕهنگيان، بێ گوێگرتن بۆ هيچ جۆره واسيطهيهك ... هتد.

---

[٧٢]. الضر ريزال . الضر لايزال با لضر . يتحمل الضر اخالص لدفع الضرر عام و الضرر الاقل لدفع الضرر الاكثر .. الضرر رات تبيح المحظورات.

به كەمترین خۆ خەریك كردن بە مێـژووەوە ئەو یەكسانییە لـە هەموو قۆناغەكانی دادگای ئیسلامیدا ڕەچاو ئەكرێن.

ـ لە كاتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئافرەتێك دزیی كردبوو، لەبەر ئەوەی كە ئافرەتەكە خاوەن عەشیرەت و پلەوپایەی دنیایی بوو، پێیان عـەیب بوو یاسـای ئیسـلامی بەسـەردا تطبیـق بكـرێ و دەسـتی ببڕدرێـت، گـەڕان بـۆ واسـیتەیەك بـۆ لالأنـەوە لای پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بۆیـان دەركـەوت خۆشەویسـترین كەس لە دڵی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت)و نزیكترین كەس لە پێغەمبەرەوە ـ أسامەی كوڕی زەیـد ـ ە، هانایـان بۆ بـردە لای أسامە (خوای لێ ڕازی بێت)، ئەویش چووە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) تكای لێبووردنی بۆ ئافرەتەكە كرد، پیغەمبـەری خـوا فـەرمووی (بۆیـە نەتـەوەكانی پـێش ئێـوە لەناوچوون، ناویـان و چاكەیان بـزر بـوو، چونكە پیاوماقوڵ و وەجاخزادەو شەریفەكانیان دزییان بكردایە ئەیانخستە پشـگوێ و لێیـان بێـدەنگ ئـەبون، بـەڵام ئەگـەر هـەژار و پەككەوتـە دەستەكانیان دزییان بكردایە، یاسایان بەسـەردا تطبیـق ئـەكردن و تۆڵەیان لێ ئەكردنەوە، سوێند بێت بە خوا ئەگەر فاطمەی كچی

محەمـەد واتـە فـاطمەی کچـی پێغەمبـەر(ﷺ) خـۆی، دزی بکـات، دەستی ئەبڕم .[72]

ب . جارێك قەڵغانێکی جەنگی لە عەلی کوڕی ئەبی طالب بزر بوو، پـاش ماوەیـەك قەڵغانەکـەی لـە لای گاورێـك دۆزییـەوە و داوای لێکردو نەیدایەوە، پێشەوا عـەلی ڕۆیشـتە لای قازیی ئەو کاتـە و شـکاتی لـەو پیـاوە گـاورە کـرد، قـازی نـاردی بـە دوای کـابرای گاوردا، بەرامبەر بە حەزرەتی عەلی وەکو یەك ڕایگرتن، پرسیاری کرد لە حەزرەتی عەلی وتی: ها عەلی، واتە نەی وت ئەبو حەسـەن، یـان هـەر نـاوێکی تـری ڕێزگـرتن کـە لـە دەرەوەی دادگـا عـەلی پـێ بانگ ئەکرد، داوات چییە لەم پیاوە؟

حەزرەتی عەلی فەرمووی ئەو قەڵغانە هی منە، نە فرۆشتومە و نـە بـە کەسیشـم بەخشـیوە ماوەیەکـە دیـار نیـە، وا ئێسـتا لای ئـەم پیاوە دۆزیومەتەوە و ئێستا نامداتەوە. ئینجا قازی ڕووی کردە کابرای گاور و وتی: تۆ ئەڵێی چی؟

من عەلی بە درۆزن نازانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە قـەڵغانی ئـەو نییە قەڵغانی خۆمە. دیسان قازی ڕووی کردە عـەلی و فـەرمووی: تۆ شاهیدت هەیە؟

---

[72]. والذي نفس محمد بيدية لو فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها.

حـەزرەتی عـەلی فـەرمووی: نـەخێر شـاهیدم نییـە. ئـەمجا قـازی فەرمووی: کەواتە دادگا بڕیاریدا بەوەی کە قەڵغانەکە هی ئەو پیاوەیە و هی عەلی نییە، چونکە بەڵگەی نییە بۆ بەتینکردنی داواکەی، کـابرای گـاور قەڵغانەکـەی هـەڵگرت و لـە دادگـا هاتـە دەرەوە، بەڵام پاش ئەوەی کابرای گاور چەند هەنگاوێك لە دادگا دوورکەوتـەوە، گەڕایـەوە بـە دەنگێکـی بـەرز لەبـەردەم قازیـدا هاواری کرد و وتی: وەڵڵاهی ئەمە ڕەووشتی پێغەمبەرانە، عەلی کـە (أمـیر المـؤمنین)ە لای قـازی خـۆی٧٤ ، شـکاتم لێ ئـەکات و قازییەکەی خۆی بە یەك چاو سەیرمان ئەکات، کەواتە ( اشهد ان لا اله الله و اشهد ان محمد رسول الله ) و موسڵمان بوو، لە دوایدا وتی وەڵا ئەم قەڵغانە قەڵغانی حەزرەتی عەلی یە.[٧٥]

ج. ئـەبو زەڕی غـەفاری یـەکێك بوو لـە هـاوڕێ خۆشەویستەکانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسـەر بێـت) بـیلالی حەبەشـی کـە بەندەیەکی ڕەش پێست بوو . ابو بکر . کڕی بووی، ئازادی کرد بوو، جا ئەبوو زەڕ جارێك بە بیلال ئەفەرمووێ: یا ابی اسود . واتـە کوڕی ڕەشە. کـاتێ ئـەم وشـەیە گەیشـتەوە بـە پێغەمبـەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، پێغەمبەری خوا زۆر پەست

---

[٧٤]. دیارە ئەو گاورە، چونکە دووربووە لە ئیسلام، وای زانیوە قازی خەلیفەیە.

[٧٥]. المساوات بین الاسلام و الحزب / عبد المنعم الضر / ص ٧٧. ٧٨

بـوو، بـە ناخۆشـییەوە بـە (ابـو زەڕ)ی فـەرموو، ئـەبوو زەڕ بزانـە کـوڕی سـپی واتـە مرۆڤـی سـپی پێسـت، هـیچ گەورەییـەك نییـە بەسەر کوڕی ڕەشدا، واتە مرۆڤی ڕەش پێست٧٦

هـیچ چـارەیەك نـەما بـۆ ئـەبوو زەڕ ئـەوە نـەبێ کـە ڕۆشـت و بەرەوڕوو لەبەرپێی بیلال دا کەوت و ڕووی چەقاندە خۆڵەکەی و سوێندی دا کە بە پێڵاوەکانی لە کەللەی سەری هەڵبدات، بەڵکو خوا لێ ببورێ، بەڵام لـە هـەموو یاساکانی تردا چینێکی جیاواز هەیـە لـە ژووروی یاسـاوەن و یاسـا وەکـو لاسـتیك بۆیـان ئەکێشرێت، جا ئەو چینە، چینی پرۆلیتار، یان سپی پێست، یـان پـارتی کاربەدەسـتی وڵاتەکـە بـێ، چەسـپاندنی یاسـا و شیاویی بۆ هەموو کات و مرۆڤێك، نە بە ژمارەی زۆری زانکۆیەو نـە بـە ڕەنگـاو ڕەنگـی گۆڤـار و ڕۆژنامەیـە، بـەڵکو چەسـپاندنی یاسا و قەدەغەکردنی خراپەکاری و بەدەستهێنانی بەختیاری لە هەر شوێنێکدا، بەستراوەتەوە بە تەوژم و لێشاوی بیروباوەڕەوە، وا لە خوارەوە نموونەیـەك ئەهێنینـەوە ئـەو کاتـە زۆر بـە ئاسـانی بۆمـان دەرئەکـەوێ هـەتاوی یاسـای ئیسـلامی لـە کـوێ و چـرا و قوتیلـە و یاسـاکانی کـوفری ئـەمڕۆ (هـەموو ڕۆژەکـانی تـر) لـە

---

[٧٦]. لەبەر ئەم یەکسانییە ڕاستەقینەی ئیسلام بوو کە زۆربەی ڕەشەکانی ئەمریکا لە دەستی یاسای دیموکراتی کارتۆنی ڕۆژئاوا هەڵاتن و باوەشیان بە ئیسلامدا کرد.

کوی‌[77] ؟ کێمان هەیە شارەزای زیانی عارەق خواردنەوە نەبین..؟ کێمـان ڕاپـۆرتی دەیـان پزیشـك و پسـپۆڕانمان نەخوێندۆتـەوە دەربارەی زیانی عارەق خواردنەوە؟

با بێن بەراوردێك بکەین لە نێوان هەوڵدانی قەدەغە کردنی ئەم خواردنـــەوە پیســـە لـــە نێـــوان یاســـای ئیســـلام و یاســـا پێشکەوتووەکانی سەدەی بیستەمدا، نموونە لە وڵاتانی خۆمـان ناهێنمەوە، چونکە ئەویش بە دواکەوتوو دائەنرێت لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ( خۆبەگ ) کردن لای خۆمان بۆتە مۆدیل، بەڵکو لە وڵاتێك و لە گەلێك نموونە ئەهێنمەوە کە خۆیان بە یەکەم وڵات و یەکەم گەلی پێشکەوتووی سەر زەوی ئەزانن، ئەو وڵاتە و گەلە و وڵاتی ئەمەریکا و گەلی ئەمەریکیە، لە ساڵی ١٩٢٠ دا لەسەر بڕیار و داوای پزیشکەکانی ئەمەریکی، دەوڵەت بڕیاری قەدەغەکردنی خواردنەوە و کڕین و فرۆشتنی عارەقی دەرکرد و سزای سەختی بۆ عارەق فرۆشان و عارەقخۆران دانا.

ئەمە یەکەمجارە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هەوڵ بدرێ بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی بە هێزی یاسای بێئایین[78].

---

[77]. سەیری کتێبی ( نضرية الاسلام و هدية ) و القانون و الدستور ابو الاعلى المودودی ص١٣٥ . ١٤٧ بکە .

٢١ . سەیری کتێبی ماڵکۆلم نیکس /زعم المسلمون السود فی امریکا، بکە.

بۆ چەسپاندنی ئەم یاسایە بە سەدان کۆمەڵی داری مەیخانە "Anti saloon league" دروست کرا و بە ملیۆنان کۆڕی دواندەری "خطابە" گیرا بۆ باسکردنی زیانی عارەق خواردنەوە و هەزاران، بەڵکو بە ملیۆنەها کتێب و نامیلکە دانرا و چاپکرا و بڵاوکرایەوە، بۆ چەسپاندنی زیانی لە دڵی عارەقخۆراندا، تەنیا بۆ بڵاوکردنەوەی وتارەکانی ئێزگە "٦٥" ملیۆن دۆلار خەرجکرا و "٩" هەزار ملیۆن لاپەڕەی نووسین دژی عارەق لە نێوان ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێب و ئۆرگان و نەشرەدا بڵاوکرایەوە، ئەمانە بێجگە لەو هەموو پارەی لە شانۆگەری و فلیمی سینەمایدا خەرج کرا.

لە ساڵی ١٩٣٣ دا دیوانی دادگای ئەمەریکی بەیاننامەیەکی دەرکرد و تێیدا وتبووی، لە ساڵی ١٩٢٠ هەتا ئەمساڵ ١٩٣٣ هەزار و دوو سەد کەس کوژراوە و نیو ملیۆن کەس بەندکراوە و ملیۆن و نیوێک دۆلار "غرامە" سەنراوە، بەڵام ئەنجامەکەی گەیشتە کوێ..؟

ئەم هەموو زیانی دارایی و گیانی و کاتە، تەنیا بۆ یەک شتبوو، ئەویش بۆ ئەوە بوو بە گەلی ئەمەریکی ڕۆشنبیر و پێشکەوتووخواز و پێشکەوتوو، بچەسپێنن کە پێشکەوتنخوازی و زانیاری یەخەی خۆیان لە عارەق و عارەقخۆران هەڵئەتەکێنن،

بەڵام لە ئەنجامدا پووچ بوو، نەك تەنیا باسەکەیان و دامودەزگای دادگاکانیـان بونـه قنلاشـکی سـەر لافاوی عـارەق، بـەڵکو لـه پـڕ توانییان ڕووی هـەموو ئەمریکا بکەنـه عـارەقخۆر، ئـەویش ئـەوە بوو کە - ڕۆزفلت - ی سەرۆك کۆمار خۆی بەیاننامەی سـەربەسـتی عارەقخواردنەوەی خوێندەوە.[79]

ئینجا با بێینە سەر چۆنێتی چارەسـەرکردنی ئـەم نەخۆشیەو کووشندەیە لە یاسای ئیسلام. نەخۆشـی عارەقخواردنـەوە. چۆن بنـەبڕی کـرد و چـەند زانیارییانـە تیمـاری برینـەکانی کـرد... ئیسلام چارەسەری نەخۆشی عارەقخواردنی کرد لـەناو گـەلێکی زۆر عـارەقخۆردا، گـەلێ عـارەقخۆری تـر لـه گـەل ئـەورووپا و ئەمریکای هەموو کاتێ.

ئیسلام چارەسەری ئەم نەخۆشییەی کرد لـەناو گـەلێکی دوور لـه هـەموو شێوەیەکی هوشیاری و زانیـاری. خۆشەویستی ئـەم گەلـه بـۆ عـارەق پێویسـتی بـه باسـێکی زۆر دوورو درێـژ هەیـە، ئەگەر بڵێین هەموویان هەر بە عارەق گۆشکرابون، هـیچ درۆیـەکی تێدا نییە. بۆیە نموونەیەکی دیار ئەڵێین لە زمانی عەرەبیدا و ئەوکاتـه (٢٥٠) وشـه بـۆ عـارەق و مانـای عـارەق لـه گفتوگـۆ و نووسین و هەڵبەسـتدا بەکارئەهێنرا، کـه ئەمـە لـه هـیچ زمـانێکی

[79] - سەیری کتێبی - الانسان فی ظل ادیان - د. عمارة نجیب ص ٩٨ - ٩٩ بکە.

تردا نییە، ئەمەش ڕۆچوونی عەرەبمان پیشان ئەدات لەناو لیستی عارەق خواردنەوەدا. عارەق خواردنەوە شتێکی زۆر زۆر ئاسایی بوو لە ناویانداو بە دەگمەن ماڵ ببوایە هەموویان عارەقخۆر نەبونایە، لەم ناو گەلە دۆستی عارەقەدا هاتن و پرسیاریان لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) کرد لە بارەی عارەقەوە، ئەویش ئایەتێکی پیرۆزی قورئانی بۆ خوێندنەوە کە ئەفەرمووێ : { يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ } (البقرة: ٢١٩).

واتە: پرسیارت لێ ئەکەن لە بارەی عارەق خواردنەوە و قورمارکردنەوە، تۆش بڵێ . ئەی محەمەد پێیان بڵێ . ئەمانە تاوانی گەورەن هەر چەندە سوودی بۆ چەند کەسێك تێدایە، بەڵام تاوانەکەیان گەورەترە لە قازانجەکەیان، جا کاتێ موسڵمانان و هاوڕێیانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) ئەم ئایەتە پیرۆزەیان بیست، هەندێکیان وازیان لە عارەق خواردنەوە هێنا، چونکە خوا ئەفەرموێ تاوانی گەورەیە ئەگەر چی خواش لێی قەدەغە نەکردبون، بەڵام هەندێکیان هەر ئەیان خواردەوە بە بیانووی ئەوەی خوا ئەفەرمووێ: قازانجی بۆ هەندێك تێدایە. ماوەیەك شێوەی عارەق بەم شێوەیە مایەوە هەتا

له كاتی نوێژكردندا قەدەغە كرا، وەك حەزرەتی عەلی ئەفەرمووێ جارێك عبدالرحمن كوڕی عەوف لەگەڵ كۆمەڵێ لە هاوڕێكانی پێغەمبەردا دەعوەتی كردبووین و پاش نانخواردن عارەقێكی زۆری گێڕا و زۆرمان خواردمانەوە و هەندێكمانی سەرخۆش كرد. كاتێ نوێژ هاتە پێشەوە بە جەماعەت نوێژمان كرد. یەكێكمان بووین بە پێشنوێژ و لە نوێژەكەدا لەبەر سەرخۆشی، ئایەتەكەی بە هەڵە خوێندەوە، هەتا خوا ئایەتی نارده خوارەوەو فەرمووی: { يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ } (النساء: ٤٣).

بە قەدەغە كردنی عارەق خواردنەوە لە نوێژدا، زۆربەی عارەق خۆران بە یەكجاری وازیان لە عارەق هێنا، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر ڕۆچوو بون لە عارەقدا، هەموویان وازیان لێ نەهێنا، هەندێك مابون بە شێوەیەك عارەقیان ئەخواردەوە كاتی نوێژكردنیان نزیك نەبوایە، بەم شێوەیەش ماوەیەك بەسەرچوو، عارەق خواردنەوە سیما و دیاردە و كۆلكەی ناو كۆی هەموو سەردەمێكی نەفامی بوو، لە هەموو خولەكانی مێژوودا هەر لە چەرخی نەفامی ڕۆمانی و یۆنانی و فارسییەوە هەتا چەرخی نەفامی عەرەب و هەتا چەرخی نەفامێتی سەدەی بیست. دیارترین ڕواڵەتی هەموو نەفامییەك (سێكس - جنس) و عارەق

بووە، ئێستاش لە کۆمەڵگای نەفامێتی خوارووی ئەفەریقا ـ کە ئەڵێن گەلێکی وەحشن ـ دیارترین خواردنەوەی سەر سفرەیان عارەقە، وەکو لە کۆمەڵگای نەفامێتی سوید کە بەلای خۆیانەوە پێش کەوتووترین گەلن، یان لە پێشکەوتووەکانی ئەمڕۆن ـ ئەوانیش دیارترین خواردنەوەیان عارەقە، هەروەها ڕواڵەتی کۆمەڵگا نەفامەکانی لای خۆمان هەمان مەسەلەیە.[80]

خۆ دیارە ئاینی ئیسلامیش دوژمنی ڕاستەقینە و دەوای کوشندەی هەموو ڕواڵەتێکی نەفامێتییە، لە هەموو کات و سات و لە هەر گەلێکدا هەبێ. جا کاتێك کاتی دیاریکراوی خوایی هاتە پێشەوەو لاشەی کۆمەڵی مووسوڵمانان توانای ئەو برین سازییەی پەیدا کرد، یەکسەر فەرمانی قەدەغە کردنی عارەق خواردنەوەو کڕین و فرۆشتنی دەرچوو.

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} (المائده : ٩٠)

واتە: ئەی باوەڕدارەکان عارەق مەستەکی بە هەموو جۆرەکانییەوەو قومار و پشکە کۆشتی ـ گردو ـ پیسن و ئەمانە کرداری خووی شەیتانن خۆتانی لێ بپارێزن و دەستیان لێ هەڵگرن، هەتا لە ژیانی هەر دوو جیهاندا سەرکەوتوو بن.

---

[80]. فی ظلال القران ـ سید قطب / بەرگی سێیەم / ل٣٠ ـ ٣٩ سەیر بکە.

هــەتا ئەفــەرمووێ : { وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُوا۟ۚ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ } (المائدە : ٩٢)

واتە: خۆ ئەگەر واز لەو خووە پیسانە ناهێنن و لە فەرمانی خوا یاخی ئەبن، چاك بزانن كە نێرراوەكەی ئێمە محەمەد . د.خ . تەنیا ڕاگەیاندنێكی ڕۆشن و ئاشكرای لەسەرە .

بــەم بەیاننامــە خواییــە بــە شــێوەیەك ڕەگوڕیشــەی عــارەق ریشەكێش كرا و خاكەسار كرا، وەكو ڕۆژێـك لـە ڕۆژان نـەبووبێ، ئەو كۆمەڵە عارەقخۆرە نەبووبن و كۆڕی عارەقخۆران و مەستان لەو كۆمەڵگایەدا نەگیرابێ ...

ئەنەسی كوڕی مالك ئەفەرمووێ كاتێ كە عارەق لە ناو ئێمەدا حەرام كرا، هیچ خواردنێك و هیچ ژیانێك نەبوو لە ژیانی عارەق خۆری لای عەرەب خۆشتر بێت، ئیسلام هیچ شتێكی لـێ حەرام نەكردین ئەوەندەی عارەق نەخواردنەوە بەلامانەوە گران بووبێ، بەڵام كاتێ كە حەرام كرا و قەدەغە كرا، هـەموومان كوپـە شـەراب و گۆزە عارەقەكانمان بردو لـە سـەر جادە ڕژانمان، هەنـدێكمان كوپــە و گۆزەكانمــان و هەندێكیشمان بـەگڵاو ئـەمان شـۆری و پاكمان ئەكردەوە. شاری مەدینە ئەتوت بارانی عارەقی لێ باریوە، لە كۆڵانەكانیدا گۆماوی عارەق دروست بوو بـوو، ماوەیـەك بۆنی

عارەق سەرانسەری شاری مەدینەی گرتبۆوە.[81] بەڵێ ئیسلام بە تاقە وشەیەك . فاجتنبوه . هیچ ڕواڵەتێکی عارەق و عارەق خۆریی نەهێشت و ئەوا نزیکەی . (١٤٠٠) ساڵێکە ئەو حەرام بونەی کە حەرام کراوە، حەرامە و بە ملیۆن ملیۆنان خەڵکی ئەم سەر زەوییە ئەبینیٚ لە ماوەی ژیانیدا نەیخواردەوە و نایخواتەوە، بەبێ ئەوەی دادگایەك هەبێ سزای بدات و بێ ئەوەی هیچ هێزێك هەبێ چاوی لێ زیت بکاتەوە. ئەمەیە جیاوازیی نێوان یاسای ئیسلام و یاساکانی هەموو بیروباوەڕێکی تر لەم سەر زەوییەدا.

ئەمەریکا ئەگەر یەکەم دەوڵەت نەبێ، دووەم دەوڵەتە لە سەڕووی زەویدا بەو هەموو هێزی پڕوپاگەندەوە کە هەیەتی و بەو هەموو ژێریی نەخشەکێشانەوە و بەو هەموو خەرجکارییەی کە کردی، ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە دیمان. بەڵام ئیسلام، نە گۆڤار و ڕۆژنامە، نە دادگای تایبەتی، نە کۆبونەوە و نەخشەکێشان، نە هیچ خۆ شڵەژاندنێك . تەنیا . فاجتنبوا . لە کوێیە؟ و ئەمریکا و ڕوس و ئەوروپا لە کوێ...؟

---

[81]. نحن و الحضارة الغربية . ابو الاعلى مودودي / ص٥٣

## یاساکانی ئیسلام :

ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەکو بەرزترە لە هەموو یاسا ئادەمییەکان بەرزتریشـە لـە هـەموو ئاینـەکانی تـر، هەرچەندە ئایینـەکانی تـر ڕووتن لـە یاسـا، چونکە یاساکانی ئیسلام وەکو ئاینەکانی تـر پشتئەستووری (موعجزە) و (خوارق) نییە، هەتا بتوانێ بە هـۆی پەستی و دەستەوستانی مرۆڤەوە لە کردنـی ئەو کارە سەریان پێ شۆڕ بکات بۆ فەرمانی ئاینەکە، بەڵکو بەهۆی بەرزیی پلـەی یاسـاکە خۆیـەوە و بـەربڵاوی و بـاڵ کێشـانی بەسـەر هـەموو گۆشـەکان و کـون و کەلەبـەرەکانی ژیـانی ئـادەمیزاد و چارەسەرکردنی هەموو کێشەکانی مرۆڤ لە هەر چەرخ و کات و شوێنێکدا هەبێ، ئەتوانێ دڵی پیاو۔ زانایان ۔ و ژیـران لە خۆی کـۆ بکاتـەوە، بـە هـەزاران پەپولـە لـە زاناکـان لـە دەوری تیشـکی هەتاوەکەی کۆبکاتەوە.[٨٢]

هیچ کێشەیەك نییە لە ژیانی مرۆڤدا ( لە هەر شوێنێك بێت) لە یاسـای ئیسـلام - شـریعه الاسـلام- دا باشـترین و تاقانـە چارەسـەری بـۆ دانـەنرابێ، ئـیتر ئـەو کێشـەیە کێشـەیەکی کۆمەڵایـەتی یـان ڕامیـاری یـان جـەنگی، یـان کێشـەی نێـوان

---

[٨٢]. الانسان فی ظل ادیان . د. عمار نجیب ، ل٩٤

دەوڵەتان بێ.[83] یاسایەك ماوەی (١٤٠٠) ساڵ ڕێباز و ڕژێم و کەرتی زۆربەی دانیشتوانی ئاسیا و ئەفەریقا و بەشێکی ئەوروپا بێت و چەرخ و خولی سارا و بیابان و سەرلوتکەی چیا و دۆڵ و شیوی گەرمیان و کوێستان و کورد و عەرەب و فارس و تورك و پاکستان و هندستان و ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات و خوارو ژوورو بکات و کێشەی مرۆڤی ڕەش و سپی و زەردو سوور چارەسەر بکات، یاسایەك پاش تێپەڕ بونی نزیکەی چواردە سەدە بەسەریداو لە ساڵی ١٩٣٢ دا، کۆنگرەی یاساکانی جیهان کە لە (لاهای) بە سترا بۆ بەراوردکردنی هەموو یاسا زیندووەکانی سەر زەوی، لە پاش لێکۆڵینەوەیەکی دوور و درێژ و توێژینەوەیەکی هەموو یاساکان، بڕیاریاندا کە شەریعەتی ئیسلام شەریعەتێکی وردی بەربلاوی بەش بەشی بەهێزە، بۆ ئەوە ئەشێ بکرێتە سەرچاوەی هەموو یاسا تازەکان.[84]

یاسایەك گۆنگرەی یاساناسانی جیهان لە ـ پاریس ـ ساڵی ١٩٥٢ هەمان بڕیار بەرانبەری دەربکات .[85]

یاسایەك ئەو هەموو نەتەوە و هۆز و کۆز و خێڵ و عێڵە و ڕەش و سپی و بۆرە، ئەم ماوە دوور و درێژ لەژێر سایەیدا ژیابن

---

[83]. شريعة الاسلام ـ يوسف قرضاوي ل٩٩

[84]. روح الدين الاسلامي ـ عضيف طبارة ـ ل ٣١٢

[85]. النظام الروحي و المقومات شريعة / د. محسن عبدالحميد . ل٢١

و بێ ئەوەی جیاوازییەك بووبێ لە نێوانیان، یان مافی یەکێکیان بۆ یەکێکی تریان پێشێل بکات. یاسایەك ئەم هەموو کات و ساڵ و مانگ و ڕۆژ و سەعات و کاتەی خستبێتە دوای خۆی و هەزاران دوژمنی زانا و بلیمەتی هەبوو بێ نەیان توانیبێ تاقە ڕەخنەیەکی (موضوعی) لێ بگرن. یاسایەك بە بونی ئەمانە و هەزاران شتی تر، دیارە لە هەموو موعجیزەیەك موعجزەترە و پێویستی بە هیچ شتێك نییە تەنیا بە مرۆڤ نەبێ.[86]

ڕەنگە هەندێ کەس بڵێن با ئەم یاسای ئیسلامەمان هەبێ و کەڵك لە یاسای تریش وەربگرین؟ ئەمە هەڵەیە، چونکە.

١. شەریعەتی ئیسلام لە هیچ ڕویەکی ژیانی ئادەمیزادەوە نا تەواوی نییە، هەتا ئێمە ئەو ناتەواوییەی پێ پڕ بکەینەوە، پێویستمان بە هیچ یاسایەکی ئەوروپایی یان مارکسی یان هیچ جێگایەکی تر نییە.

٢. هەموو یاسایەك نیشانە و مانای بونی ئەو گەلە خاوەن یاسایە و هەموو یاسایەك بە ئەندازەی جیاوازی گەلە خاوەن یاساکە و گەلێکی تر لە یاساکەیەوە جیاوازە، بۆ نموونە بە ئەندازەی جیاوازی هەمەڕەنگی نێوان گەلی ئینگلیزی لەگەڵ گەلانی هیندی و یابان، یاساکانیشییان ئەوەندە جیاوازن،

---

[86]. شريعة الاسلام خلودها و صلاحها لكل زمان و مكان . ص١٦

تەنانەت هەر یاسا مارکسییەکەی ڕوسیا و چین و یەگسلافیا و ئەلبانیا و ... هتد

هــەر یەکــەیان بــە ئەنــدازەی جیــاوازی گــەلانی ولاتەکــە لەگــەڵ یەکتریدا جیاوازن، بەڵکو دوژمنایەتییان هەیە[87].

ئێمــەیش گــەلی موســڵمانین و شــەریعەتی ئیســلام بۆتــە خــوێنی شادەماری ژیانمان و هــەر خوێنێك لەو سەرچاوەوە نەهاتبێ و لــەو چەشــنە نــەبێ، لاشــەمان وەری نــاگرێ و لێمــان ئــەبێ بــە نەخۆشی و دەردودوو.

٣. هــەموو یاســایەکی تــری دەســتکردی مــرۆڤ، سەرچــاوەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤ و مرۆڤ پەرستیان، کۆمەڵێ مرۆڤ پەرستی، تــەنها یاســای ئیســلامە خــوا بــە تــەنیا ئەپەرســتێ و تــەنیا چەسپاندنی لەسەر شانی ئادەمیزاده٨٨ .

٤. پێویستمان بە یاسای تر نییە بەش بەشمان بکات بە ـ یسار ـ ویسار متطرف ـ و یمین ـ یمین مطرف ـ و یاسای چینایەتیمان فێــر بکات و دژایــەتی و زۆرانبــازی چینایەتیمان پیشان بدات. ئێستا بە سەرپێیەکەوە باسی یاساکانی ئیسلام ئەکەین.

---

[87] ـ سەیری کتێبی الاسلام القانونیة الاستاز الشهید. عبد القادر عودة / ل٢٥ ، ٣١. بکە.

[88]. سەیری کتێبی هذا الدین ـ شهید سید قطب ـ چاپی چوارەم ـ ل١٨ـ ٢١ بکە.

شەریعەتی ئیسلام بەش بەش کراوە بۆ چەند یاسایەك:
١. یاسای ڕامیاری ( النظام السیاسی ) .
٢. یاسای کۆمەڵایەتی ( النظام الاجتماعی ) .
٣. یاسای دارایی و ئابووری ( النظام المالیة و الاقتصادیة ) .
٤. یاسای بەرگری و جەنگی ( النظام الدفاعیة و الحربیة ) .
هەر یەکە لەم یاسایانەش ئەبن بە چەند یاسایەکی ترەوە و نموونە بۆ هەریەکەیان دێنینەوە.[89]
نموونە بۆ یاساکان :
١. یاسای کۆمەڵایەتی ئیسلامی وردترین و بەربڵاوترین یاسای کۆمەڵایەتییە لە جیهاندا و بەڵکو لە هەموو سەرانسەری مێژووی یاساکانی کۆمەڵایەتی ئادەمیزادی ئێستا و ڕابووردوودا، ئەوەیش وەکو جێگای تاك لە کۆمەڵدا، سەربەستی تاك لە یاسای مەدەنیدا، مافی ئافرەت، مافی ماڵداری، مافی خوێندن، مافی کار کردن، مافی شوو کردن، مافی پرس پێکردن و ڕاوێژ ... هتد .
چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوان ژن و پیاوان بە بەخێوکردنی منداڵ و ئەرکی خێزان ( الاحوال الشخصیة ) یاساکانی

[89]. سەیری کتێبی النظم الاسلامیة . د. صبحی صالح بکە .

خواپەرستی، سزای تاوانبار، دز، چەتە، سیخوڕ، پاشگەز بووەوە لە ئیسلام (مرتد)... هتد.

٢. یاسای ڕامیاری لە ئیسلامدا یاسایەکی دیاری کراوی نەخشە کێشراوی نەگۆڕاوە، وەکو:

أ. فەرمان بۆ شەریعەتەکە نەك بۆ گەل.[٩٠]

ب . گەل ( سەرۆك . امام ) دائەنێت.[٩١]

ج . میری بە دەست گەلەوەیە.

د. ڕاوێژ بنچینەی هەموو کاروبارێکە.

ه . هەموو نەتەوەیەك مافی ڕۆشنبیری و بەجێهێنانی نەریتی خۆیان لە چوارچێوەی ئایندا هەیە.

و. ناموسوڵمان مافی دیاری کراویان هەیە و ئەرکی دیاری کراویان لەسەرە.[٩٢]

---

[٩٠]. خوا باشتر ئەزانێ لە گەل.

[٩١]. بۆ چۆنێتی هەڵبژاردن . الانتخابات . لە ئیسلامدا، سەیری کتێبی ( الاسلام) ی د. منیر البیاتی الدولة القانونیة و النظام السیاسی، ل٤٤٧ بکە.

[٩٢]. ئەبێت زیاتر لە موسڵمانەکان ڕێزیان بگیرێت، بۆ ئەوەی خۆیان خۆیان بە بێگانە نەزانن لە دەوڵەتی ئیسلامدا، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەفەرموێ : (من عادی ذمیا فانا خصمة الیوم القیامة) واتە: هەر کەسێ دوژمنایەتی لەگەڵ کافرێکی دانیشتوانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی بکات، من دوژمنی ئەو کەسەم لە ڕۆژی قیامەتدا.

٣.یاسای دارایی و ئابووری، وەکو: یاسای دارایی و ئابووری لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا تاقانە یاسایە و سەربەخۆترین یاسایەکی جیاوازە لە هەموو یاساکانی تر.[٩٣]
چونکە نە وەك سەرمایەداری جڵەوی تاك (الفرد) شل ئەکات هەتا بە ئارەزووی خۆی بدا لە هاونیشتمانییەکەی و هاومرۆڤایەتییەکەی بچەوسێنێتەوە، نە وەك کۆمۆنیستیش.
هیچ نرخێك بۆ تاك . مفرد . بۆ (انسان) دانەنێت و جڵەو بۆ چینێك شل ئەکات هەتا ببنە خوای چینەکانی تر و ئەگەر:
. حزب . ڕۆزیان نەداتێ لە برسا بمرن، چونکە یاسای ئابووری ئیسلام یەکەم یاسایە کە بیرەوەری (خۆماڵی کردن) (تأمیم)ی لەسەر زەوی داهێنا، ئەوەتا پێغەمبەری ئیسلام (دروودی خوای لەسەر بێت) ئەفەرمووێ:( الناس شركاء فى الثلاثة . الماء . و الكلأ. و النار )[٩٤]...
واتە هەموو گرۆی مرۆڤایەتی لە هەر بیروباوەڕ و نەتەوەیەك بن، هاوبەشن لە سێ شتدا، لە سامانی ئاوی کێڵگە و لەوەڕگا و سامانی ئاگری، واتە هەرچی سامانی گشتی هەیە .

---

[٩٣]. النظم الاسلامية . د. صبحى صالح، ل٣٥٢ . وة كتێبى اقتصادنا، محمد باقر صدر. سەیر بکە.
[٩٤]. سەیری کتێبی معالم الشرعية الاسلامية، د. صبحى صالح، ل ٢٥٧ بکە.

چونکه یاسای ئابووری ئیسلام یەکەم یاسابوو ئێستاش یەکە یاسـایە بناغـەی سۆشیالسـتی ڕاسـتەقینەی لـەناو گەلانـدا چەسپاند و دروشمی ( الما ما الله و الناس عباد الله )[٩٥]

واتـە سـامان سـامانی خوایـەو هـەموو گـرۆی مرۆڤایـەتی بەخێوکراوی خوان، هاوبەشن لە سامانی بەخێوکەرەکەیاندا .

هـەڵکردوو، چـونکە ئیسـلام تاقانـە یاسـایە کـە سەربەسـتی ڕاسـتەقینەی بەخشـی بـێ بە گـرۆی مرۆڤایـەتی . سەربەستی ئـابووری، سەربەسـتی بیروبـاوەڕ، سەربەسـتی ڕامیـاری، بـە مەرجێك پاڵەپەستۆ نەخاتە سەر سەربەستی خەڵکی تر،

( لا اکـراه فـی الـدین ) واتـە زۆرە ملـێ نییـە لـە ئـاینی پـیرۆزی ئیسـلامدا، هـەموو کەسـێ سەربەسـتە موسـڵمان ئـەبێ یـان کـافر.

(متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا)

واتە ئەوە کەی ئەو خەڵکەتان کرد بە بەندە و کۆیلەی خۆتـان کە بە ئازادی لە دایك بوون ؟

چـونکە مـافی ماڵـداری داوە بـە پیـاو و ژن وەك و یـەك و بـێ جیــــاوازی {لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ }

(النساء: ٣٢).

---

[٩٥] ـ سەیری (المال فی القران) بکە.

واته هەر كاسپی و داراییەك پیاو پەیدای بكات هی خۆیەتی و هەر داراییەك ئافرەت پەیدای بكات و هەر دەرامەتێكی دەستبكەوێت، هی خۆیەتی و بۆ هیچ كەسێك نییە لێی داگیر بكات .

چونكە یاسای ئابووری ئیسلامی تاقانە یاسایە كە لە مانای هەژاری و نەبونی گەیشتبێ و چارەسەری كردبێ ( كاد الفقراء ان یكون كفرا )

واته نزیكه هەژاری ببێتە (كفر)، واته پیاوی هەژار كافر ببێ و هەژاری بەرەو كافربوونی ڕابكێشێ .

چونكە یاسای ئابووری ئیسلامی ئەزانێ چۆن جموجوڵی كشتكاری هان بدات و یارمەتی بدات (ما من مؤمن یغرس غرسا او یزرع زرعا، فیأكل منه طیرا او انسانا او بهیمة الا كان له به صدقة) واته : هەر مووسوڵمان و خاوەن باوەڕێك شتێك یان درەختێ بچێنێ و باڵندە یان مرۆڤ یان بێزمانێك لێی بخوات، ئەوا لای خوا بەخێر بۆی ئەنووسرێ .

(من كانت له أرض فلیزرعها فان لم یستطع ان یزرعها و عجز منها فلیمنها اخاة المسلم ولا یؤجرة ایاها)٩٦ .

[٩٦]. سەیری كتێبی . اشتراكیة عمر . محمود شبلی / بەرگی یەكەم، بكە.

واتـه : هـەر کەسـێ زەوی هەیـە بـابیکێڵێ و بچێنێ، خـۆ ئەگـەر نـاتوانێ بیکێڵـێ و دەسـتەڵاتی نییـە بـا بیبەخشـێ بـە بـرا موسڵمانەکەی بەکرێ نەیداتێ .

چونکە زەوی مڵکی کەس نییە و هەموو مرۆڤێکی تێدا هاوبەشە. عومـەری کـوڕی خـەتتاب بڕیـاری دەرکـرد هـەر جووتیارێـك یـان خـاوەن زەوییـەك بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ زەوییەکـەی بـەبێ بەهانـە (عزر) نەکێڵاو کـەڵکی لێ وەرنـەگرت، لێـی ئەسـەنرێ و ئـەدرێ بـە یەکێك بەکاری بهێنێت، ئیتر نازانم موڵکانـەو زەوییانـەی خـاوەن زەوییـەکان و بەگـەکان چـۆن لـە جوتیارەکانیـان ئەسـەندو چـۆن ئیسلام یان پیاوانی ئاین لێی بێ دەنگ ئەبوون.

٤. یاسای بەرگری و جەنگ : دیـارە ئیسـلام وەکو بیروبـاوەڕێکی جیهانی، بەڵکو وەکو تاقانە ڕێبـازی ژیـان و دژی هێـزی شـەڕ و سـەربازەکانی شـەیتان لـە هـەمووکات و شـوێنێکدا ئـەبێ یاسـایەکی تایبـەتی بـەرگریی ئیسـلامی لـە هـەردوو بەرگەکـەدا، جەنگی سەربازی و جەنگی بیروباوەڕی، یاسایەکی ڕێكوپێك و نەخشەیەکی دیاری کراوی خۆی هەیە .

{وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ} (الانفال: ٦٠)

واتە : بۆ ئەو کافرانەی شەڕتان پێ ئەفرۆشن و ئەبنە کۆسپ لە ڕێی بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامدا، هەتا لە تواناتا هەیە هێزی بەرگری و سەرکوت کردنیان بۆ ئامادە بکەن، هەر لە پەتی وڵاخ بەستنەوەوە هەتا گەورەترین چەکی ئەو سەردەمە، بۆ ئەوەی دوژمنەکانی خواو دوژمنەکانی خۆتان بترسێنن .

{وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا } ( الأنفال: ٦١ )

واتە خۆ ئەگەر حەزیان لە ئاشتی و ڕێکەوتن کرد تۆش ئاشتیت پێ خۆش بێ.

وە یاسای جەنگی ئیسلامی چوارچێوە و هۆی هەڵگیرساندنی و کاتی جەنگ دیاری ئەکات .

{أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ} (الحج: ٣٩، ٤٠)

واتە ئیجازەی جەنگ هەیە بۆ ئەوانەی کە بە ناهەق لێیان کوژراوە و ستەمیان لێ کراوە و خوا بەدەستەڵاتە سەر کەوتنیان دەست بخات. ئیجازەی جەنگ بەوانە دراوە بە ناهەق لە نیشتمان و لانەیان ئاوارە کراون و هیچ تاوانێکیان نییە، لەوەی کە ئەڵێن (خوا پەروەردگارمانە) .

( سەرەڕای سوپای ئاسایی کۆمەڵێ پێشمەرگەی هەیە)٩٧
خۆ ئەگەر لاپەڕەی قوربانی سەربازەکانی ئیسلام ئەم دیـو و ئـەو دیـو بکـەین، بەشـێوەیەك مـرۆڤ سەرسـام ئـەبێ و ئـەزانێ ئەمانـە جـۆرێکی تایبـەتی بـون لـە مرۆڤـان و ئـەڵێ چـۆن ئـەم هـەموو پاڵەوانی و جوامێرییان لێ هاتووە.؟!.

[97]. النظم الاسلامية / ٤٩٨/ سەرباسی . الفدائيون ..

## ڕەخنەکانی کوفر لە یاساکانی ئیسلام :

سەربازەکانی کوفر لەبەر ئەوەی چرا قوتیلەکەیان بگرێت و چەند گێلێك لە دەوری تارماییە دوکەڵاوییەکەی کۆببنەوە، ئەبێ هەوڵێکی پووچ بدەن بۆ دروستکردنی هەورێك بۆ گرتنی هەتاوی یاساکانی ئیسلام و بۆ ئەوەی ئابڕووی یاساکانی خۆیان ( ئەگەر هەیانبێ ) نەچێ ، لەبەر ئەمە پەلاماریان داوەتەوە بە چەند ڕەخنەیەکی منداڵانە لە یاسای پیرۆزی ئیسلام ، هەرچەندە ( وەکو وەڕین بە ڕۆژ وایە ) بەڵام لەبەر ئەوەی پێویستە منداڵیش ژیر بکرێت ، وا بە سەرپێییەکەوە وەڵامیان ئەدەینەوە

١. ئافرەت لە یاسای ئیسلامدا.

کافرەکان ئەڵێن یاسای ئیسلام ستەمی کردووە لە ئافرەت لە دوو ڕووی یاساییەوە. لە ڕووی شایەتی و لە ڕووی میراتەوە.

أ. ئەڵێن یاسای ئیسلام یاسایەکی ستەمکارە و ستەمی لە ئافرەت کردووە، بۆ ئەبێ دوو ئافرەت لە شایەتیدا بە یەك پیاو دابنرێت ، ئەگەر بڕوایش ناکەن ئەوەتە قورئان ئەڵێ: {وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ} (البقرە: ٢٨٢)

واتە لەو قەرز و دامەدا کە ئەیکەن، با دوو شایەتی پیاو شایەت بن لە نێواندا، خۆئەگەر پیاو نەبوو، با پیاوێك و دوو ئافرەت کە

هەردوولا پێی یان ڕازی بن، ببن بە شایەت، بۆ ئەوەی ئەگەر ئافرەتێکیان لە یادی چوو ئەویتریان یادی بخاتەوە .

ئەمە ڕاستە، لەم جۆرە شتانەدا دوو ئافرەت لە بری پیاوێکە، بەڵام ئایا ڕاستە ئیسلام و یاسای ئیسلام ئافرەت بە نیوەی پیاو دائەنێت؟ نامانەوێ لێرەدا باسی مافی ئافرەت لە ئیسلامدا بکەین، بەڵام ئەوەندە ئەڵێم کە سەدەی بیست و سەدەکانی دوای بیستیش، ئایا ڕاستە کاتێ مرۆۆ ددانی ژانی کرد بڕواتە لای وەستایەکی دیوار بۆی تیمار بکات، یان دەریبهێنێ ؟

یان کاتێ ویستی دیواری حەوشەکەیان بکات، بڕوا بە دوای پزیشکێکدا بۆ دیوار کردن؟ دیارە نەخێر، بۆ چی؟

لەبەر ئەوەی هەرکەسە و پسپۆڕی خۆی، نە پزیشک پسپۆڕە لە دیوارداو (تەناف شاوڵی) نە وەستای دیوار پسپۆڕیی پەیوەندی هەیە بە ددان دەرهێنانەوە، هەرکەسش خۆیی و پسپۆڕی خۆی، مەسەلەی شایەتی لە ئیسلامدا مەسەلەی پسپۆڕی و شارەزاییە، بەڵێ ئافرەت لەم شتەی پێشەوە (کڕین و فرۆشتن، قەرز و قۆڵە) کە پسپۆڕی نییە و کاری ئەو نییە، دوو ئافرەت بەرانبەر یەك پیاوە، بەڵام ئایا ئەزانن ئەو شتانەی کە ئافرەت تێیدا پسپۆڕە و شارەزایی خۆیەتی و کاری خۆیەتی، هەندێ جار ئافرەت بەرانبەر بە دوو پیاوە و هەندێ جار (شایەتی تاقە ئافرەتێك) بە

شایەتی چوار پیاوە، ئەمە لەو شتانەی کە پسپۆڕی خۆیەتی، خۆ ئەو شتانەش کە پسپۆڕی خۆی نییە، دوو ئافرەت لە بری شایەتێکی پیاو دانراوە، لەبەر چی ئەو دوو ئافرەتە دانراوە؟

ئایا لەبەر ئەوەیە کە ئیسلام هەست بە ناتەواوییەك ئەکات لە ئافرەتدا ؟ یان لەبەر نازیری یان لەبەر تێنەگیشتنی ئافرەتەکە ؟ نەخێر لەبەر ئەمانە هیچیانە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە ئەو شتە پەیوەندی بە کاری ئافرەتەوە نییە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ئافرەت لەبەر دڵی نەرمی.[98]

لەبەر هێرشی بەزەیی ناو دڵ و دەروونە ناسکەکەی، زوو شتی لە یاد ئەچێ، خۆ ئەگەر ئافرەتێکی تری لە کێشەکەدا لەگەڵدا بێ و هەریەکەیان یادی ئەوی تری بخاتەوە، چی تێدایە ؟

ئایا بیر خستنەوە هیچ شوورەیی و نەنگی تێدایە.

(فتـذکر احـداهما الاخـری) واتـە هـەر یەکـەیان یـادی ئـەویتر بخاتەوە. دیارە لە ئیسلامدا مەسەلەی شەرەف گەڵێ گرنگترە لە مەسەلەی پارە، ئەگەر لە مەسەلەی پارەدا پیاوێك بەرانبەر بە دوو ئافرەتە، بەڵام لە کێشەی شەرەف و ناموسدا ئافرەتێك بەرانبەر بە دوو پیاوە.[99]

---

[98]. شبهات حول الاسلام. د. محمد قطب ل١٠٨

[99]. المراة بين البيت و المجتمع / ل٢٧١

دیسـان هـەر لـە مەسـەلەی پـارە و ئابووریـدا کـاتی وا هەیـە ئافرەتێك بەرانبەر بە دوو پیاوە.

بۆ نموونە، ئەگەر پیاوێك بمرێت و سەروەت و سامانێکی زۆری لە دوا بەجێ بمێنێ، بەڵام خێزانەکەی سکپڕ و حامیلە بوو، لە کاتێکدا کە ئەو ئافرەتە منداڵەکەی ئەبێ و منداڵەکەی ئەمرێ، ئالـەم کاتـەدا بەشـکردنی کـابرای مـردوو وەسـتاوە لەسـەر یـەك وشە، شایەتی یەك ئافرەت، ئەگەر مامانەکە یان سستەرەکە بڵێت منداڵەکە بەزیندوویی بووە و دوایی مردووە، ئەوا هەموو سامانی پیاوەکە ئەگوێزرێتەوە بۆ سەر منداڵە مردووەکە و دوایی بەش ئەکرێت بەسەر کەس‌وکاری منداڵەکەدا، بەڵام ئەگەر منداڵەکە هـەر بـە مردوویـی بووبێـت، بـە پێـی شـایەتی مامانەکـە، ئـەوا سامانەکە بەسـەر کەس‌وکاری باوکەکەیدا دابەش ئـەکرێت، کـە ئەمـەش جیاوزییەکی گـەڵێ گـەورە لـە دابەشـکردنەکەدا دروسـت ئەکات. بەڵام ئەگەر مامان نەبوو ئەبێ دوو پیاو شایەتی بدەن بە مردن یان بە زیندوویی منداڵەکەی، ئەی بۆ لێرەدا ناوترێ ستەم لە پیاو کراوە، بە نیوەی ئافرەتێك دانراوە .

یـان ئەگـەر کێشـەیەکی دەسـتدرێژی شـەرەف دروسـت بـوو، ئافرەتەکە نێردرا بۆ لای پزیشکێکی ئافرەت بۆ ئەوەی بزانـێ کچە یان ژن .

ڕاپۆرتی ئەو پزیشکە ئافرەتە لە بری شایەتی دوو پیاوەو (جار جـار چـوار پیـاوە)، کەواتــە مەسـەلەکە مەسـەلەی پسـپۆڕی و شـارەزاییە. نـە سـتەم کردنـە لـە ئـافرەت و نـە بڕیـەنگ لـە مـافی ئافرەت.[100]

ب - تێنەگەیشـتووان لـە یاسـای ئیسـلام و شـەریعەتی ئیسـلام ئەڵێن: ئیسـلام مـافی ئـافرەتی پێشـێل کـردووە لـە میراتـدا، ئـەوە نییە خوشك بە نیوەی برا دائەنێ ؟

ئەوە نییە قورئان ئەفەرمووێ:

{ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوۡلَـٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ } (النساء : ١١)

واتە خوا ئامۆژگاریتان ئەکات لە بارەی بەشـی منداڵەکانتان، لـە میراتدا بەشی کوڕ دووقاتی بەشی کچە.

بۆ ئەوەی ڕاستی مەسەلەکەمان بۆ دەربکەوێ، کە ئیسـلام ئـاینی زانیـاری و نەخشـەی پاشـەڕۆژی هـەموو کۆمـەڵ و خێزانێکـە، پێویستە بگەڕێینـەوە بـۆ ئـافرەتی سـەرەتای ئیسـلام و لـە پـێش ئیسلامدا کە بە هیچ جۆرێ نە زۆر و نە کەم میراتی نە ئەدرایە (بەڵکو خۆی وەکو میراتی ئەبوو بە پشکی میراتگرێکی تر) لەبەر ئەوە ئەیان وت چونکە ئافرەت ولاخداری لێ نایـەت و لـە جەنگدا

[100]. موسوعة عقاد/ محمود العقاد/ بەرگی چوارەم . ل٤٦١

دەوور نابینێ و ناتوانێ چەك بەكاربهێنێ و ناشتوانێ تالانی پەیدا بكات، لەبەر ئەوە ئافرەت مافی میراتی نییە.١٠١

ئافرەت نەك تەنیا لە ڕووی میراتەوە بەو شێوەیە سەیر ئەكرا، بەڵكو خۆیشی وەكو ئاژەڵ و چوارپێ ئەكڕدرا و ئەفرۆشرا، هەتا هەتاوی ئازادی قورئان و ڕزگاركەری هەموو چینەكانی ئادەمیزاد، تیشكی زێرینی بەسەر جیهاندا پەخشان و ئافرەت بووە هاوبەشی پیاو لە هەموو شوێنێكدا، لە جەنگدا، لە خوێندن و زانیاریدا، لە مافی كاسپی و داراییدا، لە میراتیدا، یەكەم ئافرەتێك كە بووە میراتگر لە ئیسلامدا، خێزانی سەعدی ئیبن ئەبی ڕەبیع بوو، كاتێ هاتە لای پێغەمبەری خوا و فەرمووی قوربان (سعدی) مێردم لە غەزای ئوحدا شەهید كراوەو دوو كچی لە كچەكانی هاتووە و هەمووماڵەكەی بردووە و هیچ بۆ ئێمە نەماوەتەوە، تەنانەت كەس نایان خوازێ، چونكە داراییان نییە.١٠٢

پێغەمبەر (ﷺ) دۆش داما و نەیئەزانی چی بكات و چی بفەرمووێ، فەرمووی بەڵكو خوا كێشەكەتان بۆ چارەسەر بكات.

---

[101]. المراة بين و المجتمع / ل٢٧١

[102]. سەیری تەفسیری . فی ظلال القران . سید قطب . بەرگی دووەم، چاپی حەوتەم، ل٢٦٣ بكە . هەروەها سەیری ئافرەت لە كۆمەڵگای ئیسلامدا بكە.

پاش ماوەیەك ئایەتی میرات ئایەتی ١١ ـ ١٤ی سورەتی نساء هاتەخوارەوە.

پێغەمبەری خوا ناردی بەدوای مامەی منداڵەکانداو فەرمووی ئـەو میراتییـە هەشـتیەکی مـافی دایکەکەیـەو کچـەکانیش هەریەکەیان سێیەکی ماڵەکەیان ئەکەوێ و ئەوەی کە بمێنێتـەوە بۆ تۆ. جا وەرن بە گیانێکی واقعی و بیرێکی ڕاستییەوە سەیری لیژنـە و تانـە و تەشـەری کوفر بکـەین بەرانبـەر بـە پێغەمبـەر و موسـڵمانەکان، کـە لـە شـەریعەتی پێشـەلانی ئەوکاتـەدا هـیچ ئافرەتێـك میراتگـر نـەبووە و ئێسـتا ئـەو مامەیـە ئـەبێ سـامانی براکەی لێ بسەنرێ و بدرێ بە برازا (کچەکانی)، ئەمـە شۆڕشـێکە شۆڕشگێڕان نەبێ کەس نرخی نازانێ ... بەو شێوەیە ئافرەت لـە ئیسلامدا میراتی بەرکەوت. جا ئێستا با بگەڕێینەوە سەر ( بۆچی خوشك نیوەی برای بۆ دانراوە ؟ ).

ئەگـەر بـە وردی سـەیری باسـەکە بکـەین، لەوانەیـە دواجـار بڵـێن کچـەکە زیـاتر قـازانجی کـردووە لـە کوڕەکـە (کچـە، ئـافرەت بـە گشتی) دایك بێ یان ژن یان خوشك هۆی ژیانی بۆ دابین کراوە و ئەبێ، ژیانی لەسەر خۆی نەبێ، بۆ نموونە:

١. ئەگەر پیاوێك بمرێ و كچ و كوڕێكی لە دوا بەجێ بمێنێ، ئەو سامانە بخەملێنرێت بە سێ هەزار دینار. دوو هەزاری بۆ كوڕەكە و هەزار دیناری بۆ كچەكە، ئەبێ ئەو كچە (ئەو خوشكە) ئەو هەزار دینارە چی لێبكات كە هەموو خەرجییەكی لەسەر براكەیەتی و براكەی، لە سەرێتی، خوشكەكەی بژێنێ و پێویست نییە دەستكاری و داوای تاقە فلسێك لە خوشكەكەی بكات . بە زۆر . مەگەر خوشكەكە خۆی بە ئارەزووی خۆی پێی ببەخشێ.

ئایا ئێستا كامیان قازانجیان كردووە؟ ئایا خوشكەكە قازانجی كردووە یان براكە؟

٢. كاتێ كە كوڕەكە ئەیەوێ ژن بهێنێ ئەبێ پارە بكاتە ئاو، بەڵام كچەكە مارەیی وەرئەگرێت.١٠٣

٣. خۆ كاتێ كچەكە لە ماڵی مێردێتی و باوكی ئەمرێ، هەموو ئەركێكی ژیانی لەسەر مێردەكەیەتی، ئەو میراتییەی بۆی ئەڕوات وەكو دڵخۆش كردن و سەرەخۆشی لێ كردنێك وایە.

٤. ڕەنگە هەندێك وەكو (ئۆگست بێل) بڵێت: وا ئێمە بەرەو سۆشیالیستی و كۆمۆنیستی ئەڕۆین و كەس خاوەن شت نییە هەتا لە دوای خۆی بە میراتی ببرێت و ژن و پیاو و خوشك و برا

---

[103]. الاسلام و قضايا المراة العاصرة / البهى الخولى / ل٢٠٥

لە سەری بجەنگێن، پیاو کار ئەکات و ئافرەت کار ئەکات و ئەژی[104]

ئەمەش وتەیەکی ناڕاستە، چونکە: ئەو جیهانە مارکسییە میثالییەی ئەوان خەوی پێوە ئەبینن و ئەیانەوێ کەس حەزی لە خاوەنێتی نەبێ و ماڵداری خۆیی نەبێ، لە تەرازووی زانیاریدا سەنگی بۆ دانانرێ و دانەنراوە، هەتا تاقانە مرۆڤێك لەم سەر زەوییەدا ماوە خۆشەویستی ماڵداری و هەڵپەی کۆکردنەوەی دارایی هەر ئەمێنێ، خوا ڕاستترین فەرموودەی فەرمووە کە دەفــــــەرموێ: { زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا } (آل عمران: ١٤)

واتە: خۆشەویست کراوە لەبەرچاوی هەموو مرۆڤێك و هەرگیز لەبەرچاوی ناکەوێ، خۆشەویستی ڕابواردن لەگەڵ ئافرەتدا و خۆشەویستی کوڕداری و خۆشەویستیی سامان (کۆکردنەوەی ئاڵتون و زیوو) هۆی چاکسواری و ئاژەڵداری و بوونی کێڵگە و ئەمانە هەموویان هۆی ڕابواردنی ژیانی دونیان .

کەواتە هەتا ژیانی مرۆڤ ئەمێنێ، ئەو شەهوەت و خۆشیەی هەر ئەمێنێ و کە ئەوانیش بوو، مردنی بەسەردا دێت و

---

[104]. سەیری کتێبی حول المراة . ترجمة جورج المرابیش / ل٩١

هەموویان ئەبنە میراتی، وەکو ئەوان داوای کارکردنی ئافرەت ئەکەن ئیسلامیش ڕێگای کارکردنەکەی نەگرتووە و تەنیا ئەوەندە هەیە ئەبێ ئەو ئافرەتە کرێکارە بزانێت ئافرەتەو پیاوی چاوچنۆك چواردەوری نەگرێت و ئەبێ بزانێ لای ئافرەتی موسڵمان شەرەف بەنرخترە لە پارە، بەڵام ئایا ئەو ئافرەتە کارکەرەکە مرد میراتی لە دوا بەجێنامێنێ ؟

٢. ڕەخنەیەکی تر لە ڕەخنەکانی کوفر بەرامبەر یاسای ئیسلامی، ئەوەیە ئەڵێن ئیسلام ئایینە و ئاینیش هیچ پەیوەندییەکی بەسەر یاسای ئابوورییەوە هەیە ؟

خۆ ئەگەر (لام سەرلایی) چەند شتێکی تری وتبێ بۆنی ئابووری لێ بێ، ئێستا یاسای ئابووری ئەمڕۆی سەدەی بیست لە کوێ و یاسای ئابووری کاتی نەفامێتی عەرەب لە کوێ ؟

وەڵام....

ئاینی پیرۆزی ئیسلام وەکو لەپێشەوە وتمان، تاقانە ئاینێکی خاوەن یاسایە، یاسایەك تاقانە ڕێگای کامەرانی و بەختیاریی ژیان . یاسای ئابووری ئیسلامی . ئەو یاسا ئابوورییە کە پاش ڕووخاندن و تەواوبونی وزەی هەموو یاساکانی مرۆڤ لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ژیان، باوەشی چارەسەرکردنی بۆ هەموو کێشەیەك ئەگرێتەوە و چارەسەری ئەکات یاسای

ئـابوورى ئيسـلام ياسـايەكى مامناوەندييـە لـە نێـوان ياسـاى سەرمايەدارى و ياساى سۆشياليستى (ماركسايەتى)دا، هەرچى ڕواڵـەتێكى چـاكەخوازى و خێرخـواهى هــەبێ لــە ياســاى سـەرمايەدارى و سۆشياليسـتيدا، لـە ئيسـلامدا هەيـە، هەرچـى هەڵوێسـتى دژوار و ناڕاسـت و پۆخڵـەوات لـەو دوو ياسـايەدا هەيە، لە ئيسلامدا نييە.

خـۆ ديـارە ئيسـلام لـە وانيشـى وەرنـەگرتووە، ئەگـەر ئـەوان پاشخۆرى ئيسلاميان نـەكردبێ ئێمـەى موسـڵمان كـاتێ ياسايەك يـان ڕێبازێكى ژيـان، خـەتى ڕاست و چـەپى بەسـەردا دێـنين و نامانەوێ، لەبەر دەمارگيريمان و دژداريمـان لەگەڵ ئەو ڕێباز و ياسايەدا نييە، بەڵكو ئێمەى موسڵمان چاكترمان هەيـە لـەو ڕێبـاز و ڕژێمە. كاتێ ئێمە ياساى ئابوورى سـەرمايەدارى، يـان ياسـاى ئابوورى ماركسايەتى ڕەفز ئەكەين و نامانەوێ، لەبەر ئـەوە نييـە كـە ئێمـە خۆمـان هـەر لـە خۆمانـەوە دژى ماركسـايەتى يـان دژى سەرمايەدارى بين، نەخێر، بەڵكو لەبەر ئەوەيە خۆمان لە هەر دوو ياساكەيان چاكترمان هەيە [١٠٥].

پێش ئەوەى بە پەلە ئەو ياسا ئابوورييـە ئيسـلامييەى ڕۆڵـەكانى ئيسلام لێى وێڵن، باس بكەين، با لاچاوێك بگرينـە ڕووخانـدن و

---

[١٠٥]. سەيرى كتێبى ( المذهب الاقتصادى بين الشيوعية و الاسلام ) بكە.

هەرەسـهێنانی یاسـاکانی ئـابووری کۆمۆنیسـتی و یاسـاکانی ئابووری سەرمایەداری....

١/ کۆمۆنیسـتی وەکو لـه سـەرەتای ئـەم کتێبـەدا باسمـان کـرد، هـەموو ئامـانج و هیوایەکی کۆمۆنیستی (یـان مارکسی) ئەوەیـە کە ماڵدارێتی خۆیی نەمێنێ و بۆ هـیچ کـەس و هـیچ کـەس لـەم سـەر زەوییـەدا نـەبێ خـاوەنی هـیچ شـتێك بـێ، کـه وتمـان هـیچ شتێك، واتە نـه خاوەنی ئامێرەکانی بەرهـەم (ادوات الانتاج) بـێ نە خاوەنی زەوی‌وزار بێ.[١٠٦]

ئامـانجی کۆمۆنیسـتی ( لـه هـەر کەسـه بەپێی توانـا بـۆ هـەر کەسە بەپێی پێویست ) واتە هەموو مرۆڤێك چی ئارەزووی لێ بێ لە کۆمەڵگای کۆمۆنیستیدا بۆی ئامادەیه ، ئیتر پەیوەندی به کەم و زۆری کارکردنەوە نییە ...

بـەم شـێوەیە وەکـو ـ خرۆشۆف ـ لـه سـاڵی ١٩٦١ دا وتـی: ئـەو بەهەشتەی کە پیاوانی ئاینی و بۆرجوازییەکان بۆیان باس ئـەکردین، ئەمانەوێ ئەو بەهەشتە لە سەرزەوی دروست بکەین.[١٠٧]

---

[١٠٦]. سەیری کتێبی ( المراة فی تراث الاشتراکی ) بکە./ د. محمد سعید رمضان البوطی ل ٥٣

[١٠٧]. گۆڤاری toy misof of India ڕۆژ ١٩٦١/٩/١٠ له کتێبی المصحف فی عالم الاسلامی ـ محمد فراك ص٢٣

بەڵام لەبەر کلۆڵی و ناوچاو دێزی کۆمۆنیستی، ئەو بەهەشتەیان بۆ دروست نەکرا. ئەگەر سەیری ڕوسیا بکەین ئەو هەنگاوانەی لە دوای شۆڕشی بەلشەفی ( لە ساڵی ۱۹۱۸) هەتا ساڵی ۱۹۳۲، چەند هەنگاوی سۆشیالیستی بەرەو کۆمۆنیستی ناوە، وردە وردە هەنگاو بەرەو پاش ئەکشێتەوە، خۆ ئەگەر لە هەندێکی پاشگەز نەبووبێتەوە لەودۆخەدا وەستاوە و لەناو قوڕدا چەقیوە. بەڵێ . لینین . ویستی شیوعێتی ڕاستەقینە بچەسپێنیٚ، هەموو زەویوزاری لە خاوەنەکانی سەندەوە و کردنی بە ماڵی دەوڵەت، هەرچی ئامێرێکی بەرهەمی جوتیارەکان هەبوو لێی سەندنەوە و کردنی بە ئامێری میری و مۆری کۆمۆنیسی پێوە نان، برسێتی بڵاوبووەوە و دەوڵەت (پارتی) ناچار بوو هەندێ زەوی بداتەوە بە جووتیارەکان ئەوەندە نەیان چەوسێنێتەوە، وڵات گەڕایەوە دۆخی جارانی هەتا ساڵەکانی (۱۹۲۸ـ۱۹۳۰) هات و دیسان (پارتی کۆمۆنیستی) هەنگاوی سۆشیالیستییانەی نا و هەمان بەزمی ( چەك کردنی جووتیارەکان لە زەوی ) هاتە پێشەوە، بەڵام ئەمجارەیان لەگەڵ هێز و دەستەڵاتدا، دیسان جوتیارەکان دەستیان کردەوە بەمان گرتن و شۆڕش کردن....

دەوڵەتیش بەبێ بەزەیی دەستی کرد بە کوشتن و گرتن، زیاتر لە سەدان هەزار جوتیاری تێدا سەرنگوم بووە، بەپێی بەیاننامەکانی دەوڵەتی ڕوسیا، لە ساڵی ١٩٣٢ دا شەش ملیۆن ڕوسی لە برسانا مردن، هەتا ملیان بە دەوڵەتی ڕوسیا شۆڕ کرد و بڕبەنگی زۆری دا لە یاسای سۆشیالیستییە کۆمۆنیستییەکەیان و هەموو جوتیارێک هەندێک زەوی و لەوەڕگایەك و چەند سەر ئاژەڵێکی بداتێ.١٠٨

ئیتر لەو کاتەوە پاشەوپاش لێی کشانەوە، تەنیا بە وشە و دروشم نەبێ باسی کۆمۆنیستی ناکەن .....

ئەوەتە هەر ئەو خۆفرۆشەی ( کە بە هەشتی لەسەر زەویدا دروست ئەکرد )، ئەڵێ:

( ئەو مانگایەی مانگای جوتیارێکە، زیاتر شیر دەرە لەو مانگایەی لە کۆمەڵی و یەکێتی میری دایە)[١٠٩]

هەر چەندە ئەمە قسەیەکی سادەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوپەڕی ڕووخێنەری یاسای ئابووری سۆشیالیستی مارکسایەتییە یاسایەك لەسەر بنچینەی زانیاری و واقعی کۆمەڵایەتی ئادەمیزادا دانەنرێت، نەك ئەبێ بەو شێوەیە پاشەوپاش لێی

---

[١٠٨]. اقتصادنا . محمد باقر صدر ل٢١٠

[١٠٩]. لماذا رفضت الماركسية/ د. مصطفى محمود

بکشێنەوە و سمارتەی لێ بدەن، بەڵکو ئەبێ گۆڕی بۆ هەڵکەنن. کاتێ ئێمە ئەڵێین مارکسایەتی زانیارییانە نییە، ئێمە ناڵێین، بەڵکو کەڵە پیاوانی زانیاری سەدەکە ئەڵێن، ئەوەتە (ئەنیشتاین)١١٠

ئەڵێ ( ئایا ئێوە هیچ فەلسەفەیەکتان دیوە کۆنەپەرستتر بووبێ لە فەلسەفەی مارکسایەتی )..؟

ئەو مارکسایەتییەی گاڵتەی بەزانیاری و داهێنراوەکانی گرۆی مرۆڤایەتی ئەکات. بۆ ئەوەی خۆی ڕەگ داکوتێ، کە ئەمەیش کوفرە بە زانیاری و پشت کردنە لە بیرەوەری مرۆڤایەتی، ئەیانەوێ پاڵەوانان و کەڵە پیاوانی زانیاری بخەنە گێژاو و خولگەی فەلسەفەیەکەوە هێشتا بنچینەکەی خۆی نەگرتووەو دیاری نییە.[١١١]

بە کورتی یاسای ئابووری سۆشیالیستی و مارکسایەتی بۆ ئێمەی موسڵمان و (مرۆڤ)، دەست نادات، چونکە:

١. یاسای ئابووری کۆمۆنیستی ددان بە مافی مرۆڤدا نانێت و مرۆڤ بە ئامێرێکی دەستی میری و پارتی سەیر ئەکات.[١١٢]

---

[١١٠]. ئەگەر ئەڵێن ئەنیشتاین کۆنەپەرست بووە (سەرچاوە) .

[١١١]. سەیری کتێبی / الماركسية ليست فلسفة انسانية/ غازي احمد/ ل٥٧ بکە

[١١٢]. گۆڤاری الرسالة الاسلامية . ژمارە ١٠٣ ی ساڵی ١٩٧٧

هەرچی لە پارتی و میرییەوە دەرچوو ئەبێ یەکسەر جێبەجێی بکـات، وەك‌و مقەبایـەکی ڕەق‌وتـەق چـۆنی هەڵئەسـوڕێنێ و چ کارێکی پـێ ئەکات بێکات، ئەو مرۆڤـە، مافی وتنـی ٠نای ٠ی نییە.[(١١٣)]

٢. ئەگـەر دروشمـی ڕەنگاو ڕەنـگ تووشـی کورت بینمان نـەکات بگەڕێینـەوە بـۆ سەرچاوەو پاڵەپەسـتۆی هـەڵقولانی بـیرەوەری مارکسـایەتی و سۆشیالیسـتی یـان سۆشیالیسـتەکەی (هـیگڵ)، بـەڵکو خۆشەویسـتی ( گینـی ) پـاڵی پێـوە نـاوە نـەوەك خۆشەویستی و دڵسۆزی مارکس بۆ مرۆڤ. ئەویش لەکاتێکدا کە مارکس قوتابی بوو لـە زانکـۆی (بۆن)، لاو بوو، تەمەنی لە (٢٠) ساڵ تێنەپەڕیبوو، خۆشەویستییەکی بـێ پایانی ئەو کیژۆڵـەی ناوی (گینـی) بوو، ئەچێتە دڵیـەوە و ئارامی لـێ ئەبڕێت، بەڵام بەپێی نەریتی سەرمایەداری ئەوکاتـەی ئەورووپا و لەبەرئەوەی مـارکس لـە بنەماڵەیـەکی بۆرجـوازی بچـووك بـوو، ئـەویش لـە بنەماڵەیەکی بۆرجوازی گەورە بوو، بەپێی باوی ئەو کاتە هەرگیز نەئەبوو (گینی) شووی بکردایە، یان بدرایە بە مارکس، مارکس هەوڵێکی بێ ئامانجی دا بۆ ئەوەی کە باوکی (گینـی) کـە ناوی (دی برۆجویك) بوو، کاربەدەستێکی گەورەی دەوڵـەت بوو، ڕازی

---

[١١٣]. سەیری کتێبی الماركسية ليست فلسفة انسانية، ل٧٠ بکە.

بکات و بیداتێ، ئەوەندەی نەمابوو باوکی گینی ڕازی ببێ، بەلاّم مردن یەخەی باوکەی گرت و کەشتی و پردەکەی مارکسی دا بە ئاوداو ڕیسـەکەی کـردەوە بـە خـوری و کارەکـەی کەوتـە سـەر کلاّوی براکـانی ـ گینـی ـ، هـەموو خزمـەکانی گینـی ناڕەزاییـان دەربڕی لە شووکردنی گینی بە مارکس، بە تایبەتی ئەو برایەی کە ناوی (فەدیناند) بوو، مارکسی ئەویندار و شێت و کالیوە بۆ گینی، نەیئەزانی چی بکات و چی بڵێ (١١٤)

هـەر بـیری لـەوە ئـەکردەوە چـۆن یاسـایەك دابهێنـێ و یاسـای چینایەتی ئەوروپای پێ وردوخاش بکات، ئەمە بووە هێلانـەی بیرکردنـەوەی هـەتا ڕێـی کـەوت لـە یاسـا سۆشیالیسـتییەکەی (هـیگڵ) و ئۆخـەیـەکی بـۆ کـرد و باوەشـێکی پێدا کـردو دەسـتی دایـە فراوانکـردن و داڕشـتنی بەشـێوازی خـۆی ئاسـایی، هـەتا کردی بەو مارکسیەتەی کە ئێستا هەیە(١١٥)

کەواتـە بـیرەوەری یاسـای ئـابووری مارکسـی لـە چـاوگەیەکی خۆشەویسـتی مرۆڤـەوە هەڵنـەقوڵاوە، بـەڵکو لـە چـاوگەی ڕق و تۆڵەسەندن و زەبر و زەنگەوە هەڵقوڵاوە.

---

[١١٤] پاشان گینی هەڵگرت و بووە خێزانی و یارمەتیدەری بوو لە بلاّوکردنەوەی بیروباوەڕەکەیدا .

[١١٥] المذهب الاقتصادي بين الشيوعية والاسلام، ل١٤، ١٥.

٢. لابردنی خۆشەویستی ماڵدارێتی خۆیی لە دەروونی مرۆڤدا و نەهێشتنی ڕواڵەتی ماڵدارێتی خۆیی، مانای جەنگاندنە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا و هەرچی هەوڵێك بدرێت بە فیڕۆ ئەڕوات، هەرئەمیش بووە هۆی شكاندنی ماركسایەتی و دەستی تەسلیم بون بەرزكردنەوە لەلایەن سەركردەكانی ماركسایەتی. كاكی خوێنەر، وشەی قەبە و دروشمی ماركسایەتی وەكو قسەی بەرئاگردان وایە، جا توخوا ( قسەی بەرئاگردان لە كوێ و واقیع لەكوێ ؟ ) ( نیكیتا خرۆشۆف ) لە خۆیەوە نەیوتووە (مانگای جوتیارەكان شیردەرترن لە مانگای میری و یەكێتییە جوتیارییەكان ). وەرە دەستم بەرێ و بەرەو بنكەی ماركسایەتی ڕوسیا بڕۆین، سەرێك لە سەرژمێرییەكەی بەرهەمهێنانی ئەوێ بدەین، ساڵی ١٩٦١، ئەو ساڵە كە ماركسایەتی كرا بە بووك و هێنرا بۆ كوردستان و (یەكێتی گەنجان) لە شارەزوور بە گوریس زەوییان بە جوتیار بەش ئەكرد و مەلا دۆلارخۆرەكانی كوردستانیان تف باران ئەكرد .

با بزانین هەر لەو ساڵەدا قیبلەی (گەنجان) بەرهەمیان چۆن پێش خست ؟

لـه وسـاڵه‌دا ٧٠٪ی ئاژه‌ڵی وڵاته‌که‌ی به‌ده‌ستی میرییـه‌وه بـوو، ٣٠٪ی ئاژه‌ڵ به‌ده‌ستی جوتیاره‌کانـه‌وه بـوو، بـا بـزانین ڕێـژه‌ی به‌رهـه‌می ماڵـدارێتی خـۆیی (بـه‌و که‌میـه) چـۆن بـوو لـه چـاو به‌رهه‌می میریدا ؟

| به‌رهه‌م | ڕێژه‌ی به‌رهه‌می میری | ڕێژه‌ی به‌رهه‌می ماڵداری خۆیی |
|---|---|---|
| گۆشت | ٤.٨٠٠.٠٠٠ | ٣.٩٠٠.٠٠٠ |
| شیره‌مه‌نی | ٣.٤٠٠.٠٠٠ | ٢٨.٥٠٠.٠٠٠ |
| خوری | ٣٨٧.٠٠٠ | ٧٩.٠٠٠ |
| هێلکه | ٦.٣٠٠ ملیۆن | ٧٩.٠٠٠ ملیۆن |

ئه‌مه له‌کاتێکدا که له ٧٠٪ی ئاژه‌ڵ به‌ده‌ستی میرییـه‌وه بـوو،[١١٦] ئـه‌ی ئه‌گـه‌ر بـه پێچه‌وانه‌وه بوایـه ئه‌بوایـه چۆن بوایـه، هـۆی ئـه‌م شکسته چی بوو؟

هـۆی ئـه‌وه‌بوو چـونکه یاسـای ئـابووری مارکسـی توانـایی و کارامه‌ی تاك ئه‌کوژێ و پشتی له پێشکه‌وتن سارد ئه‌کاته‌وه.

---

[١١٦] الاسلام يتهدى: وحيدالدين خان، ل١٧٤.

* سـەرمایەداری: پـێش ئـەوەی بێینـە سـەر گەنـدەڵی یاسـای ئابووری سەرمایەداری، ڕووداوێکی بچکۆلانە هەیـە پێمخۆشـە بیڵێم، ئەویش:

جارێك قوتابییەکی کۆنە مارکسی و تێنەگەیشتوو لە ئیسلام، هاتـە لام و دەسـتی کـردە هێـرش بردنـە سـەر مارکسـایەتی و لـە ئەنجامـدا وتـی ( واللە مامۆسـتا یاسـای سـەرمایەداری گـەلێ چاکترە لە یاسای کۆمۆنیستی ). منیش نەختێك هێمنم کردەوە و وتم: ئەها برا، قسەیەکی خۆش هەیە بۆتی بگێڕمەوە ؟

وتی: فەرموو، وتم:

سـاڵێك (سـون)ێکی زۆر هـات و قـڕی خسـتە دەغـڵودان و جوتیارەکـان زۆر پێـی پەسـت بـون و ناشـکورییان ئەکرد، بـەڵام ئەوەنـدەی نەخایانـدا تەرزەیـەکی ئەسـتوور و زۆر بـاری هـەموو دانەوێڵەیـەکی خەوانـدو مەترسییەکی بێ سنووری خسـتە دڵـی جوتیارەکـان و هـەموو دانیشـتوانی ناوچـەکەوە، جـا لـەم کـاتی تەرزە بارینەدا حەمەڕەزایەك هەبوو لە دێی کانی سێف[١١٧] ئەو سۆڵ حەمەڕەزایە سونێکی دۆزییەوە و ماچی کرد و پێـی وت (بە قوربانت بم سۆڵ سون گیان)(١١٨)

---

[١١٧] کانی سێف: دێیەکی سەر سنووریی سەر بە هەرێمی پێنجوێنە.

[١١٨] لەگەڵ ڕێزماندا بۆ سۆڵ .

بۆ تۆ ناشوكر بووین هەتا خوا تەرزەی بۆ ناردین. جا كاكە تۆش وەكو ئەو مامە سۆفیەت لێقەوماوە، چ یاسای سەرمایەداری و چ یاسای سۆشیالیستی ماركسایەتی، هەردووكیان زەرەرمەندن و زیانبەخشن و دژی گرۆی مرۆڤایەتین، كورد واتەنی:

(داروپەردوو لەحنەت لە هەردوو)، یاسای ئابووری سەرمایەداری بۆ ئێمەی مووسوڵمان ـ مرۆڤ ـ دەست نادات، چونكە یاسای ئابووری سەرمایەداری لەسەر بنچینەی ماڵداریتی خۆیی دامەزراوە و بە ناچاری نەبێ بڕوای بە خۆماڵی كردن (التأمیم) و ماڵدارێتی گشتی و ماڵدارێتی دەوڵەت نییە، كە ئەمەش ئەبێتە هۆی كۆبونەوەی سامانی گەلەكە لای چەند دەوڵەمەند و سەرمایەدارێك، دواجار ئەو سەرمایەدارانە ئەبنە گون گەورەی وڵاتەكە و یاری بە ژیان و مردنی ئەندامانی گەل ئەكەن، بەڵام ئەو ماڵدارێتییە خۆییەی ئیسلام دانی پێدا ئەنێ، لە سنوورێكی تەسكدایە و هەزاران كۆتی ئایینی و ئابووری لەسەر داناوە و لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا هەرگیز سەرمایەدار و (اقطاع) دروست نابێ.[119]

٢/ لە یاسای ئابووری سەرمایەداریدا ئەوپەڕی سەربەستی دراوە بە تاك، چی ئەكات، چی هەیە بیبێ، چۆن پەیدای ئەكات بیكات،

---

[119] اقتصادنا، محمد باقر صدر، ل٢٥٨.

چـۆن خـەرجی ئـەكات بیكـات و كـێ ئەچەوسـێنێتەوە و دەستدرێژی ئەكاتە سەر كێی تر قەیدی نییە، هەر تەنها (باج و ضریبە)كەی خۆی بدات بە میری، ئیتر ئارەزووی خۆیەتی و میریش پشتی ئەگرێ و دەست ئەگرێت بە عومرییەوە .

لە یاسای سەرمایەداریدا (تاك ـ فرد) ئەتوانێ خاوەنی هەموو سەربەستییەك بێت و دەستكاری كاروباری میریش بكات،[120]

بەڵام لە ئیسلامدا ئەگەرچی سەربەستی دراوە بە تاك و لەناو ڕیزی كۆمەڵدا جێگای دیارە، بەڵام ماوەیشی نادرێت ببێتە دڕندەیەك بۆ گیانی كۆمەڵ، هەرگیز ناتوانرێت تاك لە كۆمەڵ بپچڕێنێت و بە تەنیا بە خۆی و لاشە و بیرەوەری و هەڵسان و دانیشتن و هەست و نەستییەوە و دوور لە كۆمەڵ سەیری بكرێت، تەنانەت لە نەخۆشخانەكانیش ئەو تاكەمان دەست ناكەوێت[121]

هەر وەكو كۆمەڵ بێ تاك نییە، چونكە كۆمەڵ لە كۆی چەند تاكێك دروست بووە، یاسای ئابووری ئیسلامی تاقانە یاسایەكە مافی تاك و مافی دەوڵەت و مافی كۆمەڵ و هەركەسێكیان و

---

[120] الماركسية والاسلام، مصطفى محمود، ل٩.

[121] كتێبی ( الانسان بين المادية والاسلام ) محمد قطب و باسي الفرد والمجتمع، ل١٣٦.

هەریەکـەیان بـە جیـا جیـا، سـنووریّکی پـۆلاینی یاسـایی بـۆ دارشتوون، چەند جوانە بە یاسای ئابووری ئیسلامی ئەوترێت ( یاسای ئابووری جوت لانه ) واته لای تاك و لای کۆمەڵ.[١٢٢]

٣/ لە یاسای ئابووری سەرمایەداریدا مرۆڤ چاوبرسی و بە هەڵپە ئەبێ و کەس بەزەیی بە کەسدا نایەتەوە و هەرکەسە لە هەوڵی پڕکردنی گیرفانی خۆیەتی، بەڵام لای ئیسلام

{وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ } (البقرة : ٢١٩)

واته: پرسیارت لێ ئەکەن (ئەی موحەممەد) مووسوڵمانەکان چی ببەخشن ؟

تۆیش پێیان بڵی ئەوەی لە پێویستیی ژیانی خۆیان زیاتر بوو، بیبەخشن .

٤/ لـــە یاســـای ئـــابووری ســـەرمایەداریدا ڕقەبەرایـــەتی و دوژمنکاریـیـەکی فـراوان لـە نێـوان کـابرای سـەرمایەداری و کرێکارەکانیدا دروست ئـەبێ، کەسیان تـامی ژیـان بـە ئـارامی ناچێژن، ئەوەتـە ڕۆجیـە گـارودی ئـەڵێ: لـە کـاتی دەرهێنـانی یۆرانیۆم لە کارگەی گراجستاڵ، نیوەی کرێکارەکان بە نەخۆشی

---

[١٢٢] الاسلام وبناء المجتمع الفاضل، د. يوسف الشال، ل٥٦.

شێرپەنجەی سی (سرطان الرئة) ئەمرن، ئەوانەیش کە ئەمێنن ٨٠٪ یان بە سیل و نەخۆشییەکانی تر ئەمرن(١٢٣)

ئەمە وتی لەبەر خاتری ڕابواردنی چەند سەرمایەدارێك، بەڵام لای ئیسلام لەلایەکەوە ( لەبەرئەوەی مرۆڤ زۆر بە نرخترە لە سامان ) بەرهەم(١٢٤) ڕوو ئەکاتە دەوڵەت، ئەڵێ:

{مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٍ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا } (المائدة: ٣٢)

واتە: هەرکەسێ یەکێکی بێ تاوان بکوژێت بەهەر ناوێکەوە بێ، یان ئاژاوە لەسەر زەوی دروست بکات، وەکو هەموو ئادەمیزادانی کوشتبێ وایە و هەرکەسە مرۆڤێکی لێقەوماو زیندوو بکاتەوە، وەکو هەموو ئادەمیزادانی بوژاندبێتەوە وایە .

لەلایەکی ترەوە هانی خاوەن کار ئەدات کە عارەقی نێوچاوی کرێکارەکە بە مافە ڕەواکەی بسڕێ .

( اعطوا الأجير اجره قبل أن يجف عرقه ) ،

واتە هەقی کرێکار بدەن پێش ئەوەی ئارەقی نێوچەوانیان (لاشەیان) وشك ببێتەوە.

---

[123] مشروع الاصل، روجيه گارودى، ل٩.

[124] سەیری کتێبی ( أختاروا احدى السبيلين الدين أو الد، د. محمد ناسر، سەرەك وەزیرانی ئەندەنوسیا، ل٧٩.

لەولایشەوە ڕوو ئەکاتە کرێکارەکە و ئەڵێ:
( رحـم الله امـراً عمـل عمـلاً فاتقنـه ) ، واتـە رەحمـەتی خـوا لـەو کەسـەی هـەر کـارێکی ئـەنجام دا پوختـەی بکـات، بـە وردی جێبەجێی بکات .

{ لِيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنْ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَيَّ عَنْ بَيِّنَةٍ }

سورة الانفال ( ٤٢ )

# كاكڵى باسەكان